# فەرهەنگی باڵندە



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی ڕاپەڕین، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١ تەلەفۆن: ٢٢٣٢٠٢١

شوێنی ئاراس لە تۆڕی ئینتەرنێتدا:

www.araspublisher.com

# فەرهەنگی باڵندە

ئەحمەد بەحری



ناوی کتێب: فەرهەنگی باڵندە
دانانی: ئەحمەد بەحری
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٠٠
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم ڕەحمان
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٥١٣)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

## خوێنەری خۆشەویست!

ئەم کتێبەی لەبەر دەستتان دایە، بەرهەمی چەندین ساڵ هەوڵ و تێکۆشانە لە بواری فەرهەنگ نووسیدا، بەدوای شۆڕشی گەلانی ئێران و زیاتر ئازادبوونی نووسین و خوێندنی کوردی، زۆربەی قەڵەم بەدەستانی ئەم بەشە لە کوردستان لە نووسراوە جۆربەجۆرەکانی خۆیاندا، هەوڵی تۆمارکردنی ئەو وشە و ئیدیۆم و تەرکیبە ڕەسەنانەی زمانی کوردییان دا کە نەکەوتبوونە بەر ددانەی چەرخی چەبگەردی زەمان و فەرامۆش نەکرابوون. ئیمڕۆ کە چاو بەتێکۆشانی ئەم بیست و چەند ساڵەی ڕابردوودا دەخشێنین، دەبینین سەرکەوتنێکی بەرچاو لەم بوارەدا بەنسیب کورد بووە. ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، بەرەکانی داهاتوو چاو بەشێوە نووسینی ئەم چەند ساڵەی ئێمەدا بگێڕن، کۆبوونەوەی ئەو هەموو وشە و ئیدیۆم و تەرکیبە لە نووسراوەکاندا، وەک خاڵێکی بەرچاوی شێوازی نووسین کە بۆ پاراستنی وشە و لەئەنجامدا زمان بووە، سەرنج ڕادەکێشێ.

ئەم کتێبەش کاتی خۆی هەر بەو فکرە و هەر لەسەر تەوەرەی ئەو بۆچوونە نووسرا. پێمان وابوو زمانی کوردی دەبێ لە هەموو بوارەکاندا بتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی وەکوو زمانەکانی دیکە پێشان بدا. من بەپێی ژیانی منداڵیم کە لە گوندم ڕابواردووە، هەروەها ڕاوچی بوونی باب و مام و هەندێ خزم و کەسوکار، ئاشناییم لەگەڵ باڵندە ئاوییەکان زۆر بوو. هەر ئەوە هانی دام خۆ لەقەرەی ئەم کارە بدەم. کتێبی باڵندەکانی ئێران (پرندگان ایران) بەهانامەوە هات. ناوی فارسی، لاتین، فەرانسەیی، ئینگلیزی، تایبەتمەندی و شێوەی ناسینەوە و وێنەکانم لەو وەدەست هێنا و زانیارییەکانی خۆشم پێوە زیادکردن و بەشێکی کەمم لە چەند ژمارەی گۆڤاری سروەدا بڵاوکردەوە. دواتر بەپێشنیاری ئاشنا و زمان دۆستانی کورد، شانم دایەبەر و ئەم کتێبەم تەواو کرد. بێ پێچ و پەنا گرفتەکانم لەمەڕ نووسینی ئەم کتێبە باس دەکەم؛ نەکا خوێنەر تووشی هەڵە بێ.

- دۆزینەوەی ناوەکانم لە لێزانان، بەتایبەت ڕاوچییان کردە بنەمای کار.
- ناوە موکریانییەکانم کردن بەئەسڵ؛ چونکە نەدەستم بەلەهجە و بن لەهجەکانی دیکە ڕادەگەیشت و نەزانیارییەکی ئەوتۆم لێیان هەیە.
- لە باڵندە غەیری ئاوییەکان بەتایبەت تۆرەمەی هەڵۆدا تووشی گەلێ گرفت هاتم و ئێستاش جار جار هەندێ لەناوەکان دڕدۆنگم دەکەن.
- چونکە فارسەکانیش دەقاودەق کتێبی «پرندگان ایران»یان لە ئینگلیزییەوە هێناوەتە سەر زمانی خۆیان، نەکراوە وێنەکان جێگۆڕکێ پێ بکەن. ئەم گرفتە بۆ منیش هاتە پێش و نەگونجا تەرتیبیان بکەم.



- هەندێ باڵندە هەن کە نەمتوانیوە ناوی کوردییان بدۆزمەوە و بەناچار ناوێکم بۆ پێشنیار کردوون. ئەم ناوانە لە شوێنی خۆیدا خەتیان بەژێرا کێشراوە. داوا دەکەم هەم بۆ ئەم باڵندانە و هەم بۆ ڕاست کردنەوەی هەر هەڵەیەکی ئەم بەرهەمە هەیەتی، باڵم بگرن.

**ئەحمەد بەحری**

**مەهاباد-ساڵی** 2001

## نموونە

(A) باریکە-ی (B) پانیە درێژە (C) (5) (D)- پیپت پادراز
(E) Anthus novaeseelandiae
(F) Pipit de Richard
(G) Richard’s Pipi

(H)* پانیە درێژە

(I) ١٧,٥ سانتیمێترە. کلک و لاقی لە ئەوانی دیکە درێژترە. پشتی قاوەییە و خەتی پانی ئاماڵ ڕەشی پێداکشاون. سینگی زەردی کاڵە و پڕە لە خەت و خاڵی وردی بڵاو. لە جێگای برۆ و لەسەر لاجانگی خەتی مەیلەو سپی پێداهاتووە. لاق و هەروەها نینۆکی پشتەوەی درێژە. لە مێرگ و چیمەنی شەدار، گۆل و مەرەزەجاڕان دەبینرێ. (J) (219)

A ناوی باڵندە بەکوردی.
B ئەم بەشە باڵندە لە هاوتۆرەمەکانی خۆی جیا دەکاتەوە.
C ژمارەی باڵندە بۆ وێنەکان و پێڕستی زمانەکان.
D ناوی باڵندە بەفارسی
E ناوی باڵندە بەلاتین
F ناوی باڵندە بەفەرانسەوی
G ناوی باڵندە بەئینگلیزی
H ناوی باڵندە لە لەهجە و بن لەهجەکانی تری کوردیدا
I تایبەتمەندییەکانی باڵندە
J ژمارەی لاپەڕەی وێنەی باڵندە.



## تۆرەمەی ئێسکۆوا (IF)
Family STERCORARIIDAE

جۆرە باڵندەیەکی دەریایی گەورەن؛ وەک هەڵۆ وان. پەڕ و باڵیان ڕەش باوە و ڕەنگ دەگۆڕێ بەڵام سپیایی ژێر شاپەڕی باڵیان هەمیشە هەیە. شاپەڕی ناوینەی کلکیان درێژە. زیاتر ئەو باڵندانە ڕاو دەنێن کە نێچیریان بەدندووکەوەیە. لەسەر ئاو وچان دەدەن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە سەر عەرز هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: ئێسکۆوا، ئێسکۆوای قوتبی.

ئێسکۆوا (1)
اسکوای دم پیچ
Stercorarius pomarinus
Labbe pomarin
Pomarine Skua

٥٠ سانتیمێترە. شاپەڕی کلکی درێژە و لوولی خواردووە. بەدوو جۆری پڕ ڕەنگ و کاڵ دەبینرێ. جۆری کاڵ، سەر و چاوی ڕەشە، لاجانگ و تۆقی ملی سپی مەیلەو زەردە، بەرزگی سپییە و نووکی باڵ و تەنیشتی ڕێ ڕێی توندە، تۆقی ڕەشی بەسینگیدا کشاوە. جۆری پڕ ڕەنگی، قاوەییە. هەردوو جۆر خاڵی گەورەی سپییان لەژێر و پشتی باڵدا هەیە. بەباڕی تەواو پنۆک پنۆکی قاوەیی و زەردی کاڵە؛ بەرزگی ڕێ ڕێیە و شاپەڕی ناوینەی کلکی درێژ نییە. لە دەریادا دەژی. (157)

ئێسکۆوا-ی قوتبی(2)
اسکوای قطبی
Stercorarius parasiticus
Labbe parasite
Arctic Skua

٤٥ سانتیمێترە. کلکی لە ئێسکۆوا درێژ و تیژترە، هەروەها دندووکی باریکترە. جۆری کاڵی ئەو باڵندەیە، سەری ڕەشە و لاجانگ و پاش ملی سپی ئاماڵ زەردە. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە. بەرزگی سپییە و خەتی ئامال ڕەشی بەسینگیدا کشاوە. جۆری پڕ ڕەنگی، قاوەیی ئامال ڕەشە. هەم بەڕەسیوی و هەم بەباڕی پنۆکی سپی گەورەی لەباڵدا هەیە. لە دەریادا دەژی. (157)

## تۆرەمەی بەرگاویلە (2F)
Family MOTACILLIDAE

ئەم باڵندانە لەشی بچووک و باریکیان هەیە. کلکیان درێژە. لە فڕیندا بەهێزن. لەسەر عەرز بەجوانی پێڕۆ دەکەن؛ جاری وایە وەک ڕاکردن ڕادەکەن. بەدوو دەستە دابەش دەبن: ئەلب - باریکە، ب- بەرگاویلە.

ئەلف ـ باریکەکان
Pipits

* پانیە درێژە، گاڵەخۆرە (؟)، هەرزنە، هەرزنەکی

لەشیان زۆربە قاوەیی ڕێ ڕێیە. پەڕی درێژی کەنار کلکیان سپییە. وێنە و کردەوەیان لەهی چوڕە دەچێ. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر عەرز هێلانە چێ دەکەن. لەکاتی فڕیندا دەخوێنن. لەسەر داران نانیشن. بریتین لە: باریکە، باریکەی ئاوێ، باریکەی پانیە درێژە، باریکەی دارێ، باریکەی دندووک درێژ، باریکەی مل سوور، باریکەی مێرگان.

باریکە(3)
پیت خاکی
Anthus campestris
Pipit rousseline
Tawny Pipit

١٦ سانتیمێترە. لە باریکەکانی دیکە کزترە و هەر وەک بەرگاویلە دەچێ. پشتی بۆرە و بەرزگی کاڵ. ئەستوورایی باڵی خەتی ئاماڵ ڕەشی تێدایە. برۆی مەیلەو سپی هەیە. لاقی درێژ و زەردن. سەری خاڵی ورد وردی بۆری تێدایە. بەباڕی سەر و پشت و سینگی ڕێ ڕێیە. لەناو پنچکی بەیار و خیزەڵانان دەژی و زستانان دێتە ناو زەویوزاران. لەژێر پنچکان لە شوێنی نەدیو هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە.(219)

باریکە–ی ئاوێ(4)
پیت تالابی
Anthus spinoletta
Pipit spioncelle
Water Pipit

١٦ سانتیمێترە، قاچی لە ئەوانی دیکە بۆرترە. برۆی سپییە. پشتی بۆرە و بەرزگی



ئاماڵ سپی. لەپایز و زستاندا تووکی ئەم باڵندەیە ڕێ ڕێ دەبێ، بەڵام لەکاتی هێلکە کردن و کورک بووندا کاڵ دەبێتەوە و مەیلەو زەرد دەبێ. زستانان لەگۆل و ئاوگر و کەنار دەریا دەبینرێ. لەشاخان لە قەڵشتە بەرداندا هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (219)

باریکە–ی پانیە درێژە (5)
پیت پادراز
Anthus novaeseelandiae
Pipit de Richard
Richard’s Pipit

* پانیە درێژە

١٧،٥ سانتیمێترە. کلک و لاقی لە ئەوانی دیکە درێژترە. پشتی قاوەیییە و خەتی پانی ئاماڵ ڕەشی پێدا کشاون. سینگی زەردی کاڵە و پڕە لە خەت و خاڵی وردی بڵاو. لە جێگای برۆ و لەسەر لاجانگی خەتی مەیلەو سپی پێداهاتووە. لاق و هەروەها نینۆکی پشتەوەی درێژە. لە مێرگ و چیمەنی شەدار، گۆل و مەرەزەجاڕان دەبینرێ. (219).

باریکە–ی دارێ(6)
پیت درختی
Anthus Trivialis
Pipit des arbres
tree Pipit

١٥ سانتیمێترە. دەنگی لەگەڵ باریکەی مێرگان فەرقی هەیە. کەمێک قەڵەوترە و دندووکی ئەستوورترە. سینگی ئاماڵ زەردە و لاقی کاڵن. قامکی پشتەوەی کورتە. پشتی قاوەیییە و خەتی ڕەشی تێدان. بەرزگی مەیلەو سپییە و بەرسینگی خەتی وردی تێدا. برۆی زەردە و شاپەڕی دەوری کلکی سپین. تەنیا باریکەیەکە لەسەر دار دەنیشێ. لەناو گیاوگۆڵ هێلانە ساز دەکا. (219)

باریکە–ی دندووک درێژ (7)
پیت نوک دراز
Anthus similis
Pipit á Long bec
Long-billed Pipit

١٨،٥ سانتیمێترە. لە هەموو باریکەکان گەورەترە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆری ڕێ

رێیه. گەروو و، سینگ و بەرزگی ئاماڵ زەردە. کلکی قاوەیی توندە و شاپەڕی دەوری کلکی ئاماڵ زەردە و سپیایی تێدا نییە. دندووکی تاڕادەیەک درێژە. لای زۆری تەمەنی تەنیا دەژی. لە داوێنی کێو و دەشتی سازگاردا دەژی. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا، هاوینان زۆر هەیە. (218)

باریکە-ی مل سوور (8)

پیپت گلوسرخ
Anthus cervinus
Pipit á gorge rousse
Red-Throated Pipit

١٤.٥ سانتیمێترە. پشتی لە باریکەی مێرگان پڕ ڕەنگترە دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. کاتی کورک بوون تووکی گەرووی سوور هەڵدەگەڕێ و هەتا سینگی دەچێتە پێش. لە زستاندا سینگی خەت و خاڵی ئاماڵ ڕەشی لێ پەیدا دەبێ. لە کەنار گۆل و زەویوزاری شەدار دەبینرێ. (219)

باریکەی-ی مێرگان(9)

پیپت صحرائی
Anthus pratensis
Pipit des Prés
Meadow Pipit

١٤.٥ سانتیمێترە. زۆر وەک باریکەی دارێ دەچێ، بەڵام ڕەنگی پشتی زەیتوونیترە و سینگی سپیتر و پڕ خەت و خاڵترە، هەروەها دەنگیشی جیاوازە. شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. لاقی تاڕادەیەک قاوەییە و نینۆکی پشتەوەی درێژە. لەسەر داریش دەنیشێ، بەڵام کەم. ژیانی لە نێو مێرگ و چیمەنانە. زستانان دەچێتە کەنار گۆلاو و دەریا. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (219)

بێ- بەرگاویلەکان
Wagtails

* بەرزەردکە، بەرزەردیلە، بەرگاویلکە، بەرگاییلکە، گاچەڕینگ، گاچێڕین.

لەشیان باریک و کلکیان درێژە. دندووک و لاقیان لە باریکە ناسکترە. بێچکە لە کورک بوون هەر بەگەل دەگەڕێن. لەسەر عەرز یان قەڵشتە بەرداندا هێلانە ساز دەکەن. مێش و مەگەز، جاڵجاڵۆکە، شەیتانۆکە و دانەوێڵە دەخۆن. بریتین لە: بەرگاویلەی بۆر، بەرگاویلەی بەڵەک، بەرگاویلەی زەرد، بەرگاویلەی سەر زەرد.



بەرگاویلە-ی بۆر (10)

دم جنبانک خاکستری
Motacilla Cinerea
Bergeronnette des ruisseaux
Grey Wagtail

١٨ سانتیمێترە. کلکی ڕەش و درێژی هەیە، شاپەڕی دەوری کلکی سپییە و پشتی بۆری ئاماڵ شینە. هاوینان سینگی زەردە و زستانان کاڵ دەبێتەوە. پاشەڵی زەردی مەیلەو کەسکە. نێرەیان خەتی سپی بەبرۆ و لاجانگیدا کشاوە، چەنە و گەرووی هاوینان ڕەشە و زستانان سپی. مێیەیان بەهاوینان و زستان ئاماڵ کەسکە و گەرووشی سپییە. بەباڕی پشتی قاوەیی بۆرە و بەرزگی کاڵ. کاتی وچان نەبێ بەپۆل نابیندرێ. زستانان لە کەنار جۆباران دەبینرێ. لە کونی دیوار، پرد و کەندالی چەمدا هێلانە دەکا. (220)

بەرگاویلە-ی بەڵەک(11)

دم جنبانک ابلق
Motacilla alba
Bergeronnette grise
Pied Wagtail

١٨ سانتیمێترە. نێرەیان پشتی ڕەشە و نێوچاوان و لاجانگی سپییە و هاوینان گەروو و بەرسینگی ڕەشە و زستانان سپی سپی هەڵدەگەڕێ. بەرزگی ئاماڵ سپییە. باڵی قاوەییە و تووکی سپی تێدایە. مێیەیان پشتی بۆرە، لاجانگ و مل و بەرزگی ئاماڵ سپییە، خەتی پانی ڕەشی بەسینگیدا کشاوە. لەشار، ئاوەدانی، زەوی کەشاو، باغ و کەنار چەماندا دەبینرێ. لە کونی دیوار، پرد و کەندالاندا هێلانە چێ دەکا. (220)

بەرگاویلە-ی زەرد(12)

دم جنبانک زرد
Motacilla flava
Bergeronnette printaniére
Yellow Wagtail

١٦.٥ سانتیمێترە. لاقی درێژە. بەرزگی زەرد. کلکی درێژ و ڕەشە و شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. نێرەیان هاوینان سەر و لاجانگی تەواو ڕەشە. پشتی زەردی مەیلەو بۆرە. باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە و تووکی سپی تێدایە. مێیەیان لاجانگی ڕەشە، بەرزگی زەردە، کلک و باڵی ڕەشە و باڵی تووکی سپی تێدایە، سەر و پشتی زەردی

بۆرە. ئەم باڵندەیە بەباری پشتی قاوەیی کاڵە، بەرزگی شیری ئاماڵ زەردە، ملی ئاماڵ قاوەییبیە. هەمیشە لە نزیک ئاو دەژی؛ شوێنی وەک گۆل، چیمەن، زەوی کەشاو. زۆربە لە نێو ماڵاتی دەسلەوەڕ دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە دەکا. (220)

بەرگاویلە-ی سەر زەرد (13)

دم جنبانک کله زرد
Motacilla cireola
Bergeronnette citrine
Citrine Wagtail

١٦،٥ سانتیمێترە. نێرەیان هاوینان سەر و بەرزگی تەواو زەردە، کلکی ڕەشە. مێیەیان لە زستاندا وەک بەرگاویلەی زەرد دەچێ، بەڵام پشتی بۆرە و دوو خەتی سپی لە باڵیدا هەیە؛ کاتی فڕین وە دیار دەکەون. بەباری ڕەنگی ئەم باڵندەیە زۆر کاڵترە، بەرزگی ئاماڵ سپییە و پشتی بۆر. شوێنی ژیانی وەک بەرگاویلەی زەردە. زستانان زۆر هەیە. (220)

## تۆرەمەی بەرلووزەوە (3F)
## Family CINCLIDAE

بەرلووزەوە (14)

زیر آبروک
Cinclus cinclus
Cincle plongeur
Dipper

* چۆلەکە چۆمە، سینگ سپیلکە

١٧ سانتیمێترە. کلکی قولەیە و زۆر بەقیتی ڕادەگرێ. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. گەروو و بەرسینگی سپییە، زگی شێ ڕەنگە و بۆ لای پاشەڵی ڕەش هەڵدەگەڕێ. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. بەباری پشتی بۆری قورقوشمییە و بەرزگی خاڵی بۆر و ڕەشی تێدایە. ئەو باڵندەیە لەسەر ئەو بەردانەی کە لە نێو ئاودا قیت بوونەتەوە هەڵدەنیشێ و سەر و کلکی دەجوولێنێتەوە. هەر لەوێوە بینە دەکێشێتە ناو ئاو و لەژێر ئاوەوە چینە دەکا. نەوی فڕە، توند بەکەنار جۆباراندا دەفڕێ. تەنیا دەژی. هەر لە شوێنێک دەژی و جێگای خۆی ناگۆڕێ. هێلانەی خڕی خۆی لەژێر ڕەوەزی ئاو هەڵدێر و پرد و دیواری کەنار ڕووبار ساز دەکا. (242)



## تۆرەمەی پەپوسێمانە (4F)
## Family UPUPIDAE

ئاپۆ (؟)، بوبووکەرە، پاپی سلێمونی، پوپی، پەپووسلێمانکە، پەپووسولەیمانە، پەپووسولەیمانی، پەپووسلێمانی، پەپووک، پەپووکەرە، پەپولەسلێمانی، پەشوو، داوودێ دوینکل، داوودێرۆنکل، سولەیمانک دونوکول، سولەیمانۆ، سولەیمانی دوونوکول، سولەیمانێ دوونکل، شانە بەسەر، شانە سەرە، کۆکەل (؟)، کەپو سولەیمانی، کەپووکەرە، کەوکەل (؟)، هەپو، هەپووک، هەپو.

پەپووسێمانە (15)

هدهد
Upupa epops
Huppe Fasciée
Hoopoe

٢٧ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە، سەر و ملی قاوەیی کاڵە. کلک و باڵی بەڵەکە. کاکۆڵی قاوەیی کاڵە و سەری کاکۆڵی ڕەشە. دندووکی باریک و درێژ و خوارە. لەسەر عەرز چینە دەکا. لە کونی دیوار و داراندا هێلانە ساز دەکات. هاوینان زۆرە (195)

## تۆرەمەی پەڕبەڵەکە (5F)
## Family LANIIDAE

* باڵ بەڵەکە، سەقری مێشخۆر، قجی، قجی بەڵەک، قجی چاوڕەش، چۆلەکەگرە.

ئەم باڵندانە دندووکی کورت و بەهێز و قەلانگییان هەیە. قاچیان بەهێزە و جنجڕووکیشیان تیژە. زۆربە لە شوێنی بەرز هەڵدەنیشن و لەوێوە لوور دەبنە نێچیر. ئەوەی ڕاوی دەکەن بە دروو و پەلی تیژی هەڵدادەسن. لە فڕیندا بەهێزن. بەتەنیا دەژین. نێر و مێیەیان تاڕادەیەک وێک دەچن. لەسەر پنچک و دار هێلانە دەکەن. حەشەرات، مارمێلکە، مشک، باڵندەی بچووک... دەخۆن. بریتین لە: پەڕبەڵەکەی بۆری بچووک، پەڕبەڵەکەی بۆری گەورە، پەڕبەڵەکەی پاشەڵ خەنەیی، پەڕبەڵەکەی سوور، پەڕبەڵەکەی پشت شێ، پەڕبەڵەکەی سەر شێ، پەڕبەڵەکەی قەشان.

پەڕبەڵەکە-ی بۆری بچووک(16)
**سنگ چشم خاکستری**
Lanius minor
Pie-griéche á poitrine rose
Lesser Grey Shrike

٢٠ سانتیمێترە. نێوچاوان و دەوری چاوی ڕەشە؛ لە مێیەدا کاڵتر و کەمترە. بەرزگی ئامالٚ سپییە. سەر و پشتی بۆرە. باڵ و کلکی قاوەیی مەیلەو ڕەشە، بەڵام دەوری کلکی و دوو خەتی باڵی سپییە. دندووکی کورت و ئەستوورە. بەباڕی لە دوورەوە زەرد دەنوێنێ، سەر و تەنیشتی پڕ لە خەت و خاڵە و باڵ و کلکی ڕەشی ئامالٚ قاوەییە. لە زەویوزار و کەنار جادەڕێیان دەبینرێ، لەسەر داری بڵیند هێلانە ساز دەکات. (229)

پەڕبەڵەکە-ی بۆری گەورە(17)
**سنگ چشم بزرگ**
Lanius excubitor
Pie-griéche grise
Great Grey Shrike

٢٦ سانتیمێترە. لە هەموو پەڕەبەڵەکەکان گەورەترە. پەڕوباڵی ڕەش و سپییە. سەروپشتی بۆرە. بەپێچەوانەی پەڕبەڵەکەی بۆری بچووک نێوچاوانی بۆرە. چاوی کەوتوونە نێو خەتێکی ڕەشی پان، دێغێکی باریکی سپی بەبرۆیدا ڕاکشاوە. پاشەڵی ئامالٚ سپییە. باڵ و کلکی ڕەشە، خەتی سپی لە باڵیدا هەیە مێیە. خەت و خاڵی وردی کاڵی لە سینگیدا هەیە. ئەم باڵندەیە بەباڕی قاوەیی ئامالٚ بۆرە و سینگی پڕە لە خەت و خاڵ. لەسەر شوێنی بڵیندی وەک دار و دارتێل هەڵدەنیشێ و لەوێوە لوور دەبێتە نێچیر. زۆربە کلکی هەڵدەتەکێنێ و وەک چەتر دەیکاتەوە. لە کەنار لێرەوار، باغی میوە و نێو پەرژینان دەژی. جاری وایە لەسەر دار لەنێو پنجە دڕوو هێلانە دەکا. زستانان زۆر هەیە. (229)

پەڕبەڵەکە-ی پاشەڵ خەنەیی(18)
**سنگ چشم دمگاه حنائی**
Lanius schach
Pie-griéche schach
Black-headed Shrike

٢٤ سانتیمێترە. نێوچاوان و خەتی چاوی ڕەشە. سەر، پاش مل و شانی بۆرە، پاشەڵی خەنەییە. بەرزگی ئامالٚ سپییە. کلکی ڕەشە و سەری شاپەڕەکانی ئامالٚ زەردە. باڵی ڕەشە و خاڵی سپی لەسەر شاباڵی پێشەوەی دەبینرێ. لەناو باغ و



پنچکی زەوییاندا دەژی. زۆربە لە بیابانان هێلانە دەکا. (231)

پەڕبەڵەکە-ی پشت سوور(19)
**سنگ چشم پشت سرخ**
Lanius Collurio
Pie-griéche écorcheur
Red-backed Shrike

١٧ سانتیمێترە. نێرە پشتی شێ ڕەنگە، سەر و پاشەڵی بۆری مەیلەو شینە و خەتی پان و ڕەشی بەچاویدا کشاوە. بەرزگی ئامالٚ سپییە. کلکی ڕەشە و دەوری کلکی سپییە و زۆربە دەیجووڵێنێتەوە. مێیە ڕەشایی دەم و چاوی کەمە. پشتی قاوەیی ئامالٚ خەنەییە و بەرزگی مەیلەو زەرد؛ کە پڕە لە خەت و خاڵ. ئەم باڵندەیە بەباڕی قاوەیی ڕەنگە. بۆ ڕاو لەسەر پەرژینان لەنگەر دەبەستێ و باڵان لێک دەدا. لە شوێنی بەرزەوە لوور دەبێتە نێچیر. نێچیری خۆی بە دڕوو و پەلانەوە هەڵدەواسێ. لەناو پنچک و دڕکاندا هێلانە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (229)

پەڕبەڵەکە-ی پشت شێ(20)
**سنگ چشم پشت بلوطی**
Lanius vittatus
Pie-griéche á dos roux
Bay-backed Shrike

١٧ سانتیمێترە. نێوچاوان و خەتی چاوی ڕەشە. سەر، پاش مل و پاشەڵی بۆری ئامالٚ شینی کاڵە. پشت و وردە تووکەکانی باڵی شێ ڕەنگە. بەرزگی سپییە و بۆ لای تەنیشتانی شێ هەڵدەگەڕێ. باڵی ڕەشە و خەتی پانی سپی تێدایە. کلکی ڕەشە، دەوری کلکی سپییە. کردەوەی لەهی پەڕبەڵەکەی پشت سوور دەچێ،. لەسەر دار و پنچکە گیا هێلانە دەکا. (231)

پەڕبەڵەکە-ی سەر شێ (21)
**سنگ چشم کلە سرخ**
Lanius senator
Pie-grieche á tête rousse
Woodchat Shrike

١٧ سانتیمێترە. سەر و پاش ملی شێ ڕەنگە. خەتی ڕەش و پانی بەتوێڵ و لاجانگیدا کشاوە. مل و بەرزگی سپییە. پشت و باڵی ئامالٚ ڕەشە و خاڵی گەورەی

سپی لە شانیدا هەیە. کلکی ڕەشە و دەوری کلکی سپییە. پاشەڵی سپییە و کاتی فڕین دەردەکەوێ. مێیە لە نێرە بۆرترە. ئەم باڵندەیە بەباڕی تەواوی گیانی ئاماڵ ڕێ ڕێیە. لە باغاندا دەژی. لەسەر دار هێلانە دەکا. هاوینان زۆرە. (229)

پەربەڵەکە-ی قەشان(22)
سنگ چشم پیشانی سفید
Lanius nubicus
Pie-griéche masquée
Masked Shrike

١٧ سانیتمێترە. سەر و پشت و کلکی ڕەشە. برۆ و بەرزگی سپییە. مێیە سەر و پشتی بۆری ئامال شینە. بەرزگی ئامال بۆرە. کردەوەی ئەم باڵندەیە وەک پەڕبەڵەکەی پشت شێیە. بەڵام فڕینەکەی جوانترە. کەم وا هەڵدەکەوێ لە شوێنی بەرز بنیشێ. لەناو باغی زەیتوون، هەنجیر و باغاتی تەنکدا دەژی. لەسەر داری بڵیند هێلانە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (229)

## تۆرەمەی پەڕەسلێرکە (6F)
Family HIRUNDINIDAE

* پزلگرد، پڵۆزگردی، پلیزرک، پلیسر، پلیسرک، پلیسرگ، پلیسری، پلیسکر، پولیسور، پەرەستوو، پەڕەسللێرکە، پەڕەسێلکە، پەڕەسلێنکە، پەڕەسوێلکە، پەڕەسیسە، پەڕەسیکلە، پەڕەسێلکە، پەڕەسێولکە، حاجی حاجک، حاجی ڕەش، حاجی ڕەشک، حاجی ڕەنگ، دومقەس، دومقەسک، دومقەسوک، دومەقەسەک، سیاپورسینگ، سیاپوسینگ، سیپریسک، مقەسۆک، مەقسوک، هەجەجک، هەچهەجک.

ئەو باڵندانە باریک و چکۆڵەن. ملیان قوڵە و باڵیان درێژ و نووک تیژە. کلکیان دوولکە. دندووکیان کورت و سەختە. لاقیان بچووک و بێ هێزە. لەفڕیندا تیژباڵن. بەگەل دەژین. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەژێر ڕەوەز و کەلێن و قوژبنی خانووبەراندا بەقوڕ هێلانە ساز دەکەن لە هەوادا مێش و مەگەز دەگرن. بریتین لە: پەڕەسلێرکە، پەڕەسلێرکەی پاشەڵ سپی، پەڕەسلێرکەی پاشەڵ سوور، پەڕەسلێرکەی خیزەڵان، پەڕەسلێرکەی ڕەوەزان، پەڕەسلێرکەی کاڵی ڕەوەزان.



پەڕەسلێرکە(23)
پرستو
Hirundo rustica
Hirondelle de cheminée
Swallow

١٩ سانتیمێترە. کلکی دوو هاچە و درێژە. پشتی شینی توندە. گەروو و نێوچاوانی شێ ڕەنگە. ملی ئامال ڕەشە و بەرزگی سپی واشە. بەباڕی بۆرتر و دوو لکی کلکی کورتترە. بەگەل دەژین، بەڵام کاتی هێلکە و جووجکە تاق دەبنەوە. لە زەویوزار، چیمەن و ئاوگراندا دەبینرێ. لە ژێر میچی خانوو یا بەرهەیوان و تەویلاندا بەقوڕ و کا هێلانە ساز دەکا.(207)

پەڕەسلێرکە-ی پاشەڵ سپی(24)
چلچله دمگاه سفیدا
Delichon urbica
Hirondelle de Fenêtre
House Martin

١٢ سانتیمێترە. بەرزگ و پاشەڵی سپییە. سەر، باڵ، پشت و کلکی ڕەشی شین واشە. کلکی دوو هاچە و کورتە. لاقی قوڵە و تووکنە؛ تووکی وردی سپی لێ هاتووە. بەگەل دەژی و هەر بەگەلیش لەلای یەک هێلانە ساز دەکەن. لە فڕیندا تیژباڵە. لەبەرقەدی ڕەوەز و میچی حانووان بەقوڕ هێلانە ساز دەکات. هاوینان زۆرە.(207)

پەڕەسلێرکە-ی پاشەڵ سوور(25)
پرستوی دمگاه صورتی
Hirundo daurica
Hirondelle rousseline
Red-rumped Swallow

١٨ سانتیمێترە. پاشەڵی مەیلەو سوورە و پاش مل و ئاڵقەی چاوی شێ ڕەنگە. مل و بەرزگی زەردە و خەتی بەسینگیدا نەهاتووە. سەر و پشتی شینی توندە و کلکی ڕەشە. لە ڕەوەزاندا دەبینرێ؛ کە وا هەیە بێتە زەویوزاران. لە دەشت، دەور و بەری پرد و خانوواندا هەمیشە لە فڕین دایە. لە ئەشکەوت، قەڵشتە بەرد و ژێر پردان هێلانە ساز دەکا. زارکی هێلانەی وەک زاری گۆزە دەچێ.(207)

پەڕەسلێرکە-ی خیزەڵان(26)

**چلچله رودخانه‌ای**
Riparia riparia
Hirondelle de rivage
Sand Martin

**١٢** سانتیمێترە. پشتی قاوەیی کاڵە. بەرزگی سپییە و خەتی قاوەیی بەسینگیدا کشاوە. مێش و مەگەز و دانەوێڵەی سەر ئاو دەخوا. لە شوێنی ئاواڵا، لە کەنار چۆم و ئاوگران بەگەل دەژین. لە کونی کەنداڵی ڕووبار و ڕەوەزان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (207)

پەڕەسلێرکە-ی ڕەوەزان(27)

**چلچله‌ی کوهی**
Hirundo rupestris
Hirondelle de rochers
Cray Martin

**١٤,٥** سانتیمێترە. بەرزگی سپی مەیلەو بۆرە؛ بەلای دامێنیدا ئەم بۆرایییە زۆتر دەبێ. کلکی دوو هاچە نییە و خاڵی سپی تێدایە. لە دۆڵ و دەرەی قووڵ و ڕەوەزی شاخان دەبینرێ. بەقوڕ هێلانەی وەک فینجان لە قەڵشت و قوڵکەی ڕەوەزی کێوان ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (207)

پەڕەسلێرکە-ی کاڵی ڕەوەزان(28)

**چلچله بیابانی**
Hirundo obsoleta
Hirondelle du désert
Pale Cray Martin

**١٢,٥** سانتیمێترە. وەک پەڕەسلێرکەی ڕەوەزان دەچێ؛ کەمێک لەو بچووکترە و پەڕ و باڵی کاڵترە. چەنە و گەروو و بەرسینگی ئاماڵ سپییە. لە ڕەوەزی دەست پێڕانەگەیشتوو، دۆڵ و دەرەی قووڵ و کۆنە کاولی دوورەدەست هێلانە ساز دەکا. (207)



## تۆرەمەی پێ بەقوونە(7F)
Family PODICIPEDIDE

* پێ بەقنگە

باڵندەی تایبەتی ئاون. لە قووڵاواندا وردە ماسی، شەیتانۆکە و کرم و دانەوێڵەی ناو ئاو دەخۆن. پێ بەپەردە نین. کلکیان زۆر کورتە. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. کەمتر هەڵدەفڕن. بۆ لەوەڕ یا کاتی هەست بەمەترسی کردن خۆ لە ئاودا نقوم دەکەن. «بینە»یان زۆر درێژە. بەپێچەوانەی باڵندەکانی تر لاقیان زۆر بۆ لای پاشەوەیان چووە و هەر بۆیەش ئەم ناوەیان بەسەردا براوە. لەناو گیاوگۆڵی ئاوان هێلانەساز دەکەن. پێنج جۆریان ناسراوە: پێ بەقوونە، پێ بەقوونەی سەربەکڵاوە، پێ بەقوونەی شاخدار، پێ بەقوونەی گەردن ڕەش، پێ بەقوونەی گەردن سوور.

پێ بەقوونە(29)

**کشیم کوچک**
Podiceps ruficollis
Grébe castagneux
Little Grebe

**٢٦** سانتیمێترە. لە تۆرمەی خۆیدا لە هەمووان چووکترە. دندووک و ملی قوڵەیە، کلکی نییە. هاوینان ڕەنگی قاوەیییە و زستانان کاڵترە. لاجانگی مەیلەو قاوەیییە، ئەستوورایی دندووکی سەوزی مەیلەو زەردە. زۆرتر خۆ لەبەر چاوان نەدیو دەکا. هەڵنافڕێ، ئەگەری هەڵیشبفڕێ بەرزەفڕ نییە و نەوی و خێرا بەسەر ئاودا باڵێک دەفڕێ. لە گۆل و زەل و شەتی پڕ گیا و گۆڵ دەژی. (29 )

پێ بەقوونە-ی سەربەکڵاوە(30)

**کشیم بزرگ**
Podiceps cristatus
Grébe huppé
Great Crested Grebe

**٤٧** سانتیمێترە. لە تۆرەمەی خۆیدا لە هەمووان گەورەترە. کڵاوەی سەری قاوەیی مەیلەو ڕەشە، بەڵام زستانان دیاری ناکا، بەبێچۆیی مل و سەری ڕێ ڕێیە. نەوی دەفڕێ و لەکاتی فڕین سەر و ملی شۆڕ ڕادەگرێ. لە گۆڵ و ئاوگران دەژی. لەناو گیا و گۆڵی قەراغ ئاوان هێلانە چێ دەکا. ژێر باڵی پەڕی ڕەقی بەچەشنی ئەسکوێی هەیە،

جووجەڵان دەخاتە ناوی! هەر بەم حاڵەوە بینە دەکێشێ و هەڵدەفڕێ.(29)

پێ بەقوونە–ی شاخدار(31)

کشیم گوش دراز
Podiceps auritus
Grébe esclavon
Slavonian Grebe

٣٢ سانتیمێترە. لەسەر برۆی تووکی مەیلەو زەرد ڕواوە؛ لە دوورەوە وەک شاخ دەچن. تووکی بەرزگی لەهی پشتی کاڵترە و لەکاتی فڕیندا سەرباڵی سپی دیار دەکەون. سەر و ملی وەک مار ڕادەگرێ. زستانان زۆر دەبێ. کاتی هێلکە و جووجکە ڕەنگی سەری ڕەش دەنوێنێ. لە گۆل و شەتاوی شیرندا دەژی.(29)

پێ بەقوونە–ی گەردن ڕەش(32)

کشیم گردن سیاه
Podiceps nigricollis
Grébe á cou noir
Black-necked Grebe

٣٠ سانتیمێترە. بەملی ڕەش و نێوچاوانی پانیەوە لە هاوڕەگەزی خۆی جوێ دەکرێتەوە. زستانان پشتی مەیلەو ڕەش و بەرزگی سپی دەنوێنێ. هێندێک تووکی مەیلەو زەرد لە نێوچاوانی ڕواوە و لە دوورەوە وەک پۆپە دەچێ. سەری دەنووکی کەمێک قیتە. ملی ڕاست ڕادەگرێ. زستانان زۆر هەیە. لەناو گیا و گۆڵی گەوەڕی گۆلاندا هێلانە ساز دەکا.(29)

پێ بەقوونە–ی گەردن سوور(33)

کشیم گردن سرخ
Podiceps grisegena
Grébe jougris
Red-necked Grebe

٤٣ سانتیمێترە. سەری گەورەیە. هاوینان لاجانگی بۆر دەبێ، سەری ڕەش دەبێ. ملی قاوەیی توندە و دوو تیسکی چووکەی لێ ڕواوە. دندووکی زەردی ڕوونە و سەری دەنووکی ڕەشە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. بەرزگی سپی ئاوریشمییە. لە قامیشەڵان و زەلی پڕ لە گیادا هێلانە ساز دەکا.(29)



## تۆرەمەی تووتی (8F)
Family PSITTACIDAE

تووتی(34)

طوطی طوق صورتی
Psittacula krameri
Perruche á collier
Rose-ringed parakeet

٤٠ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی کەسکی ڕوونە. کلکی درێژ و نووک تیژە، باڵی نووک تیژ و دندووکی سووری قەلآنگییە. نێریان خەتێکی سووروواشی بەدەوری ملی ڕەشیدا کشاوە. توند دەفڕێ. بەگەل دەژی.(182)

## تۆرەمەی جلووت(9F)
Family PHALAROPODIDAE

جلووت (35)

فالاروپ گردن سرخ
Phalaropus lobatus
Phalarope á bec étroit
Red-necked Phalarope

* جللووت

١٧ سانتیمێترە. مل و بەرزگی سپییە. خاڵی گەورەی ئاماڵ نارنجی لە لامل هەیە. پایزان پشتی ڕێ ڕێ دەبێ. خەتی سپی بەباڵی بۆریدا کشاوە. دندووک و لاقی باریک و ڕەشە. لەقەراغ ئاو و گۆلاواندا دەبینرێ.(123)

## تۆرەمەی چرگ (10F)
Family OTIDIDAE

* چێرگ، چێڕگ، میشەسی، مێشەسی

باڵندەی ئیشکایین. لە دەشتی پڕ گیا و زەویوزاران دەبینرێن. لاق و ملیان درێژە. باڵی پانیان هەیە، دندووکیان ئەستوور و پانە. زۆرتر خۆ لە چاوان نەدیو دەکەن. لە فڕیندا تەپن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگ نییە. لە ڕووتەن و نێو گەنمان زۆر دەبینرێن. لەباتی سیکەتۆرە وەک مالآت ورگیان هەیە. لە ڕووتەن یان لەناو زەوی تەنک هێلانە دەکەن؛ دوو هێلکە دەکەن. بەهاران

کاتی جووت بوون نێرەیان گەرم دادێ؛ چەتر هەڵدەدا، بەدەوری خۆیدا دەسووڕێ. بریتین لە: چرگ، چووکە چرک، زڕەچرگ.

چرگ(36)

میش مرغ
Otis tarda
Grande outarde
Great Bustard

نێرەی ١٠٠ و مێیەی ٧٥ سانتیمێترە. نێرە پشتی پنۆک پنۆکی سوورگوێزییە، بەرسینگی خەتێکی قاوەیی پێداهاتووە، بەرزگی سپییە، لاقی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. شاباڵی ڕەشە. مێیەی چووکترە و خەتی بەرسینگی نییە. چرگ زۆر سڵە و نیزیک بوونەوە لەو باڵندەیە زۆر دژوارە. لە دەستەی چووک چووکدا دەگەڕێن. مێیە زۆرترن. لە ڕووتەن و زەویوزاراندا دەبینرێ. (112)

چووکە چرگ(37)

زەنگولە بال
Otis tetrax
Outarde canepetiére
Little Bustard

٤٢ سانتیمێترە. نێرەیان ملی بەڵەکە و پشتی قاوەیی، سەری بۆری مەیلەو شینە، بەرزگی سپییە. مێیەیان پشتی قاوەیی کەم ڕەنگە، بەرزگی سپی مەیلەو زەردە، سەر و مل و سینگ و تەنیشتی ڕێ ڕێیە. کردەوەی چووکە چرگ لە چرگ دەچێ. کەم وا هەیە ڕا بکا. کاتی خۆ حەشاردان خۆی کووڕ دەکات و بەعەرزەوە مەلاس دەبێ. باڵندەیەکی زۆر سڵە. توند دەفڕێ؛ کاتی فڕین باڵی دەنگێکی وەک فیتووی لێوەدێ. لە حەوا تەواو سپی دەنوێنێ؛ سەری باڵی ڕەشە. بەپۆل دەگەڕێن. زستانان زۆرە. لە شیناوەرداندا دەبینرێ(112)

زڕەچرگ(38)

هوبره
Chlamydotis undulata
Outarde houbara
Houbara Bustard

* تودەرە (؟)، ڕاوارە (؟)، زڕەمیشەسی، هۆورە، هۆوەرە

٦٢ سانتیمێترە. لە قەلەموونەی مێ دەکا. کلک و ملی خورمایی ڕەنگە. یاڵ و بژی



بەڵەکی هەیە؛ بەهەردوو لاملیدا هاتۆتە خوار. پشتی قاوەیی کەم ڕەنگی پنۆک پنۆکە، بەرزگی سپی و ملی بۆرە، شاباڵی ڕەشە، چاوی گەورەن. لە فڕیندا تەپە. لەبەیار و دەشتان دەبینرێ. (112)

## تۆرەمەی چورە (11F)
Family ALAUDIDAE

* جرە، جککە (؟)، جککەبۆرە (؟)، چوڕڕە، قازلاخ، قازەڵاخ

ئەم باڵندانە خۆش ئاوازن. پەڕ و باڵیان قاوەیی ڕێ ڕێیە. زیاتر هەر لەسەر عەرزن و پێڕۆن. قامکی پشتەوەی لاقیان درێژ و ڕاست و نینۆک تیژە. زیاتر بەگەل دەژین. کەم وا هەیە نێرە و مێیەیان وێک نەچن. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکەن. دانەوێڵە، جڕ و جانەوەر و کرم و... دەخۆن. بریتین لە: چوڕەپۆپنەکی، چوڕە دندووک درێژە، چوڕە سەیرەیی، چوڕە گەڵوازە، چوڕە مل ڕەشە، چوڕە هیندی، چوڕەی ئاسمانی بچووک، چوڕەی ئاسمانی گەورە، چوڕەی باڵ سپی، چوڕەی بیابانی، چوڕەی بیابانی کلک ڕەش، چوڕەی پەنجەکورت، چوڕەی پەنجەکورتی بچووک، چوڕەی پەنجەکورتی هیوم، چوڕەی داران، چوڕەی ڕەش، سریلە.

چوڕەپۆپنەکی(39)

چکاوک کاکلی
Galerida cristata
Alouette cochevis
Crested Lark

* پیزپیزاک (؟)، جوڕەکڵاونە، چنگەڵە (؟)، چوڕەپۆپنە، چوڕڕەپوپنەکی، سوریلی (؟)، سۆفیلکە، سۆفەقیتە، سۆفیەقیتە، سەر بەکڵاوە، فشەکڵاونە، کوڕکڵاو، کڵاوکوڕە، کڵاونە.

١٧ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی قاوەیی ڕێ ڕێیە. بەرزگی کاڵە، کاکۆڵی هەیە. سینگی قاوەیی کاڵی ڕێ ڕێیە. کاتی فڕین تووکی ئاماڵ زەردی ژێر باڵی دەردەکەوێ. بەباڕی کاکۆڵی کەمترە و هەروەها پشتی پنۆک پنۆکترە، لەچیمەن، ڕووتەن، دەوروبەری ئاواییان، کەنار جادەڕێیان دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە دەکا. (217)

چوڕە-دندووک درێژە(40)

**چکاوک هدهدی**

Alaemon alaudipes

Sirli du désert

Bifasciated Lark

**١٩** سانتیمێترە. دندووکی درێژ و تاڕادەیەک کووڕە. پەڕ و باڵی بۆریلەیە. خەتی ڕەشی بەکەنار چاویدا کشاوە. سینگی کونجی کونجییە و زگی سپی. لاقی درێژە و شاپەڕی کلکی سپییە. کاتی فڕین خەتی ڕەش و سپی باڵی بەجوانی دیارە. ئەم باڵندەیە گەلێ جار بێ جووڵەکردن لە شوێنێک دەمێنێتەوە و خۆی کووڕ دەکا؛ کەم وایە هەڵفڕێ، زۆرتر ڕادەکا. لە شۆرەکات و بیابانی خیزەڵان دەژی. لەسەر عەرز لەنێو پنچکان هێلانە دەکا.(218)

چوڕە-سەیرەیی(41)

**چکاوک سهرەای**

Eremopterix nigriceps

Alouette moineau á front blanc

Finch Lark Black-crowned

**١١** سانتیمێترە. دندووکی لەهی سەیرە دەچێ و وەک هی ئەو ئەستوورە. نێرەیان سەری بەڵەکە. سینگی تەواو ڕەشە و پشتی قاوەییە. مێیەیان بەتەواوی قاوەیی ئاماڵ خاکییە، ژێر باڵی ڕەشە. ئەم باڵندەیە بەگەل دەژی. لە شوێنی کەم گیا، بەیار و نێو پنچکی تەنکی دەشتان دەبینرێ. لەسەر عەرز لە نێو پنچکان هێلانە دەکا.(208)

چوڕە- گەڵوازە(42)

**چکاوک گندم زار**

Melanocorypha calandra

Alouette calandre

Calandra Lark

* چوڕڕە قازەڵاخی، گەڵوازە

**١٩** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی زۆر تووکنە. دندووکی ئەستوور و زەردە. خاڵی ڕەشی لە بەرچێڵە دایە. سینگی ڕێ ڕێی قاوەییە. لەکاتی فڕیندا شاباڵە سپییەکانی دیار دەکەون. بەباری ئەم باڵندەیە ئاماڵ زەردە و خاڵی بەرچێڵەی ئاشکرا نییە. لە بەیار، بەردەڵان و زەویوزاران دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە دەکا.(208)



چوڕە-مل ڕەشە(43)

**چکاوک طوقی**

Melanocorypha bimaculata

Alouette calander orientale

Bimaculated Lark

**١٦،٥** سانتیمێترە. سەری شاپەڕی کلکی سپییە. ملی خاڵی ڕەشی تێدایە. ڕەنگی قاوەیی کاڵی پنۆک پنۆکە. سینگی زەردی کاڵە. کردەوەی لەهی چوڕە گەڵوازە دەچێ. لەو دەشتانەی کە گیای تەنک و کورتیان هەیە دەژی.(218)

چوڕە-هیندی(44)

**چکاوک هندی**

Calandrella raytal

Calandrelle des sables

Indian Sand Lark

**١٢** سانتیمێترە. پشتی بۆر و بەرزگی ئامال سپییە. دەنگی ئەم باڵندەیە باشترین نیشانەیە بۆ ناسینی. لەکەنار ئاو و شوێنی سێڵاوگر دەبینرێ. لەسەر عەرز لەناو گیا و گۆڵی سوێر هێلانە ساز دەکا.(208)

چوڕە-ی ئاسمانی بچووک(45)

**چکاوک آسمانی کوچک**

Alauda gulgula

Alouette des champs sud asiatique

Small Skylark

**١٤** سانتیمێترە. زۆر وەک چوڕەی ئاسمانی گەورە دەچێ؛ پشتی زۆرتر قاوەیی. گەروو و ملی ئامال زەردە. شاپەڕی دەوری کلکی زەردی کاڵە و سپیایی تێدانییە. پشتی پنۆک پنۆکە. لە زەویوزار، گۆل و زۆنگ و هەروەها ئەو شوێنانەی کە گیا و گۆڵی کەم و تەنکی لێ ڕواوە دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا.(218)

چوڕە-ی ئاسمانی گەورە(46)

**چکاوک آسمانی**

Alauda arvensis

Alouette des champs

Skylark

**١٧** سانتیمێترە. پشتی قاوەیی پنۆک پنۆکی ڕەشە. بەرزگی سپی ئامال زەردە و

سینگی ڕێ ڕێیە. کلکی تاڕادەیەک درێژە و شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. نەختێک کاکۆڵی هەیە. کاتی پێڕۆ خۆ کۆم دەکاتەوە. دەتوانێ لە حەوا لەنگەر بگرێ. لە زەویوزار، گۆل و زۆنگان دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە دەکا.(217)

چورە-ی باڵ سپی(47)
چکاوک بال سفید
Melanocorypha leucoptera
Alouette leucoptére
White-winged Lark

١٧ سانتیمێترە. بەهۆی خەتی سپی باڵی لە چورەکانی دیکە دەناسرێتەوە. ئەو خەتە سپییە پانە هەتا سەری باڵی کشاوە و کاتی فڕین بەجوانی دیارە. پشتی زەردی ئاماڵ قاوەییە و ڕێ ڕێی بۆری پێداهاتووە. سەر و کلک و تووکی وردی باڵی شێ ڕەنگە، بەرزگ و ژێر باڵی سپییە و گەرووی ئاماڵ زەردە. مێیە سەری قاوەیی و ڕێ ڕێی هەیە. لەو شوێنانەی گیا و گۆڵی ئیشکی هەیە دەژی.(217)

چورە-ی بیابانی(48)
چکاوک سنگلاخ
Ammomanes deserti
Ammomane du désert
Desert Lark

١٥ سانتیمێترە. بۆری ئاماڵ زەردە. سەری قاوەیی ئاماڵ بۆرە، جاری وایە مەیلەو خورماییە. خەتی وردی کاڵی لە سینگی دایە و لە نزیکەوە نەبێ نابینرێ. جووت و جاری واشە لە دەستەی کەمدا دەبینرێ. لە بەردەڵانی بیابان و داوێنی ڕەوەزان دەژی و خۆ لە شوێنی خێزەڵان دەبوێرێ. لەسەر عەرز لەنێو پنچکاندا هێلانە دەکا.(208)

چورە-ی بیابانی کلک ڕەش(49)
چکاوک سردم سیاه
Ammomanes cincturus
Ammomane élégante
Bar-tailed Desert Lark

١٣ سانتیمێترە. زەردی کاڵە. خەتێکی پانی ڕەشی بەکلکیدا کشاوە. سەر، سینگ و



پشتی بێ خەتە. زیاتر بەگەل دەگەڕێن. لە بیابانی بەردەڵان و خێزەڵان دەژی. خۆ لە شوێنی شاخاوی دەبوێرێ.(208)

چورە-ی پەنجە کورت(50)
چکاوک پنجه کوتاه
Calandrella cinerea
Alouette calandrelle
Short-toed Lark

١٤ سانتیمێترە. لە چورەی ئاسمانی گەورە کاڵتر و بچووکترە. پشتی زەرد و خەتی بۆری تێدایە، بەرزگی سپی ئاماڵ زەردە و بێ خەت. خاڵی ڕەشی لە لاملیدا هەیە، بەڵام بەجوانی بەدی نابێ. کاکۆڵی نییە، بەڵام پێش سەری پڕ ڕەنگە. دندووکی کورت و نووک تیژ و زەردە. نەوی دەفڕێ. لە بەیاری بەردەڵان و خێزەڵان دەژی. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە.(208)

چورە-ی پەنجە کورتی بچووک(51)
چکاوک کوچک
Calandrella rufescens
Alouette Pispolette
Lesser Short-toed Lark

١٣.٥ سانتیمێترە. لە نزیکەوە بەئەو خەتانەی کە لەسەر سینگیدا هەیە لە چورەی پەنجە کورت دەناسرێتەوە. هەروەها بەپێچەوانەی باڵندەی ناوبراو ڕەنگی سەر و پشتی یەک جۆرە و خاڵی لاملی نییە و بۆرتر دەنوێنێ. لەو شوێنانەدا دەبینرێ کە چورەی پەنجە کورتی لێ دەژی. هەروەها لە کەنار گۆل و تالاوی سوێردا دەبینرێ.(208)

چورە-ی پەنجە کورتی هیوم(52)
چکاوک هیوم
Calandrella acutirostris
Alouette calandrelle de hume
Hume’s Short-toed Lark

١٣ سانتیمێترە. وەک چورەی پەنجە کورت دەچێ، بەڵام خاڵی لاملی نییە، بەرزگی بێ خەتە. دوو خاڵی بۆری لە سینگ دایە. دندووکی نووک تیژە. ئاکاری وەک چورەی پەنجە کورت دەچێ. لە نێو گیا و گۆڵی داوێنی بەردەڵانی کێوەکاندا دەژی.(218)

چوڕە-ی داران(53)

چکاوک درختی
Lullula arborea
Alouette lulu
Wood Lark

**١٥** سانتیمێترە. کلکی کورتە، ئاڵقەی چاوی سپییە و ئەو سپیاییە لەگەڵ سپیایی لاجانگ و پاش ملی تێکەڵ بووە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. خاڵی ڕەشی لە ئەستوورایی باڵیدا هەیە. بۆ وچان لەسەر دار دەنیشێ. لە لێڕوار و داوێنی تەپۆڵکان کە تاق تاق داری هەیە دەبینرێ. زستانان دێتە ناو زەویوزاران. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (217)

چوڕە-ی ڕەش(54)

چکاوک سیاه
Melanocoryph yeltoniensis
Alouette négre
Black Lark

**١٩** سانتیمێترە. نێرە گەورەتر و ڕەشە، زستانان ڕەنگی کاڵ دەبێ. دندووکی کورت و ئەستوور و زەردە، سەری دندووکی ڕەشە. مێیە زۆر لە چوڕە گەڵوازە دەچێ، بەڵام کاڵترە و خاڵی ڕەشی ملی نییە. ئەم باڵندەیە زۆر کەم هەیە. (217)

سریلە (55)

چکاوک شاخدار
Eremophila alpestris
Alouette hausse-col
Shore Lark

* زریلە

**١٧** سانتیمێترە. گەرووی زەردە. لاجانگ و بەرسینگی ڕەشە. پشتی قاوەیی کاڵە، بەرزگی ئاماڵ سپییە. نێرە خەتی پانی ڕەشی بەسەریدا کشاوە و دوو پەڕی ڕەش وەک شاخ لەسەری قیت بۆتەوە. مێیە ڕەشایی سەری کەمترە. سریلە بەباڕی خاڵ خاڵ و بۆر دەنوێنێ. ڕەشایی سەری باڵندەی ڕەسیوو لە زستاندا کاڵ دەبێتەوە. هاوینان لە کوێستان و شوێنی بەیار و زستانان لە جێی نەویتر دەژی. لەناو بەردان هێلانە دەکا. (218)



## تۆرەمەی چۆلەکە (12F)

Family PLOCEIDAE

* بەیتاک (؟)، پاسارو، پاساری، تیڤۆک (؟)، جووجک، جووک، جوونجک، جیجک، جیڤک، چوچک، چووک، چڤیک، چڤینگ، چوول، چوولەکە، چیچک، چێژیلە، چێشکە، چیویک، ساندیلکە (؟)، سێڤاندۆک (؟)، سێڤاندۆکە (؟)، شڤاندیلکە (؟)، کویشکە، کوێشکە، کیژۆڵە، کێشکە، کێشوەلە، مرچک، مریچلە، مریچڵە، مەرچلە، مەلووجک، مەلووچ، مەلووچک، مەلیچک، مەلیچە، مەلیشکە، میرچک.

ئەو باڵندە چووکانە دندووکی ئەستوور و خڕیان هەیە. لاقیان تاڕادەیەک قوڵەیە. پەڕ و باڵی ڕەنگاوڕەنگیان نییە. بەگەل دەژین و هێلکەو جووجکە دەکەن. لە فڕیندا بەهێزن. نێرەو مێیەیان یەک ڕەنگ نین. لە کون، سەر دار و ناو ڕەوەزان هێلانە ساز دەکەن. زۆرتر دانەوێڵە خۆرن. بریتین لە: چۆلەکە، چۆلەکەی بلووچی، چۆلەکەی بۆر، چۆلەکەی بەفری، چۆلەکەی بیانی، چۆلەکەی چۆماوان، چۆلەکەی داران، چۆلەکەی سەر ڕەش، چۆلەکەی سینگ ڕەش، چۆلەکەی کێوی، چۆلەکە گەردن زەرد.

چۆلەکە (56)

گنجشک معمولی
Passer damesticus
Moineau domestique
House Sparrow

**١٤،٥** سانتیمێترە. نێرە سەری بۆری توندە و بەرەو پاش ملی شێ هەڵدەگەڕێ. ملی ڕەشە و لاجانگ و بەرزگی بۆریلەیە. مێیە و باڕی ئەو باڵندەیە، ڕەشایی ملیان نییە. پشتیان قاوەیی ئامالّ ڕەشە و بەرزگیان سپی چڵکن. سەر و کلکیان وەک نێرە بۆر نییە. لەناو ئاوەدانی و زەویوزاران دەژی. لە کونی دیوار و نێو پنچک و پەرژینان هێلانە ساز دەکا. (325)

چۆلەکە-ی بلووچی(57)

گنجشک بلوچی
Passer pyrrhonotus
Moineau du Sind
Sind Jungle Sparrow

**١٢،٥** سانتیمێترە. زۆر وەک چۆلەکە دەچێ و کەمێک چووکترە. نێرە سەری کاڵترە و

ڕەشایی مل و لاجانگی کەمترە. پاشەڵی خورمایی ڕەنگە. لەنێو گیا و گۆڵ و گەزەڵێن و نزیک ئاو دەژی. هێلانەی گەورە و خڕی خۆی لەسەر پنچکان ساز دەکا. (325)

چۆلەکە-ی بۆر(58)
گنجشک خاکی
Petronia brachydactyla
Moineau soulcie pâle
Pale Rock Sparrow

١٤ سانتیمێترە. نێر و مێیە وێک دەچن. هەموو گیانی یەک ڕەنگە. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ خاکییە؛ باڵ و کلکی پڕ ڕەنگترە. مل و بەرزگی کاڵترە. خاڵی وردی سپی لەسەری و باڵیدا هەیە. لە داوێنی بەردەڵانی کێوان و شوێنی بیابانی کەم گیا و گۆڵ دەژی. زستان زۆر دەبێ. (325)

چۆلەکە-ی بەفری(59)
گنجشک برفی
Montifringilla nivalis
Niverolle des neiges
Snow Finch

١٧.٥ سانتیمێترە. نێر و مێیە یەک ڕەنگە. سەری بۆرە، ملی ڕەشە و پشتی قاوەیی و بەرزگی سپی ئاماڵ زەرد. باڵی سپییە و شاباڵی ڕەشە. کلکی سپییە و دەوری ڕەشە. مێیە و باڕی ئەو باڵندەیە بۆرترن و سپیایی باڵ و کلکیان کەمترە. دندووکی ئەو باڵندەیە بەهاران ڕەش و زستانان زەردە. بەباڕی دندووکی زەردە. قیت هەڵدەنیشێ و کلکی هەڵدەتەکێنێ. لە دوندی بەرز و بەفرگری کێوان دەژی. لە کونەاندا هێلانە دەکا. (326)

چۆلەکە-ی بیابانی(60)
گنجشک کویری
Passer simplex
Moineau blanc
Desert Sparrow

١٣ سانتیمێترە. چۆلەکەیەکی بۆری خاکییە. نێرە دەوری دندووک و ملی ڕەشە، شاباڵی ئامال ڕەش دەنوێنی. مێیە تەواو خاکی کاڵە. لەنێو پنچک و گەزەڵێن دەژی. لە کونی بەردان، سەر دارە خورما و ژێر هێلانەی قالاو هێلانەی خۆی ساز دەکا. (325)



چۆلەکە-ی چۆمان(61)
گنجشک رودخانه‌ای
Passer moabiticus
Moineau de la Mer Morte
Dead Sea Sparrow

١٢ سانتیمێترە. نێرە سەری زەردی ئامال بۆرە. ملی ڕەشە و دوو خاڵی مەیلەو زەردی لەلاجانگە. پشتی قاوەیی بۆرە و پڕە لە خەتی ڕەش. خاڵێکی گەورەی ئامال شێی لەسەر باڵی هەیە. مێیەی وەک مێیە چۆلەکە دەچێ و دوو خاڵی زەردی لەلاملی هەیە. لەنێو پنچک و گەزەڵێن و مێشە و جەنگەڵی قەراغ ئاو دەژی. هێلانەی گەورە و خڕی خۆی لەسەر داری وەک گەز ساز دەکا. (325)

چۆلەکە-ی داران(62)
گنجشک درختی
Passer montanus
Moineau friquet
Tree Sparrow

١٣.٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. خاڵێکی ڕەشی لە لاجانگە. کەللەی سوور گوێزە. دوو خەتی سپی لەسەر باڵی هەیە. لە گوندان دەژی. لە کونی دار و ماڵاندا هێلانە ساز دەکا. (326)

چۆلەکە-ی سەر ڕەش(63)
گنجشک تاغی
Passer ammodendri
Moineau des Saxaouls
Saxaul Sparrow

١٥ سانتیمێترە. ئامال زەردە. پشتی خەتی ڕەشی تێدایە. سەر و مل و پاش ملی ڕەشە. خەتێکی نارنجی وەک برۆ بەپشت چاویدا کشاوە. مێیە مەیلەو بۆرە و خەت و خاڵی کەمترە. لەنێو پنچکی بیابانان، لە گەزەڵێن و زەویوزاران دەژی. (325)

چۆلەکە-ی سینگ ڕەش(64)
گنجشک سینه سیاه
Passer hispaniolensis
Moineau espagnol
Spanish Sparrow

١٤.٥ سانتیمێترە، نێرەیان سەری تەواو سوورگوێزە. مل و سینگی ڕەشە. پشتی

ڕەنگاوڕەنگە. تەنیشتی ڕێ ڕێیە. لاجانگی سپییە. مێیە تەنیشی کاڵترە و سپیایی لاجانگی ئاماڵ بۆرە و ڕەشایی مل و سینگی نییە. لەنێو پنچک و داری کەنار ڕێگا و جەنگەڵان بەگەڵ دەژی. لە ژێر هێلانە حاجی لەگ لەگ و هەڵۆ و باڵندەی لەو چەشنە هێلانە ساز دەکا.(326)

چۆلەکە-ی کێوی(65)
گنجشک کوهی
Petronia petronia
Moineau soulcie
Rock Sparrow

١٥سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. ئاماڵ کاڵە. کلکی قوڵەیە. سەری بۆرە و خەتی قاوەیی پێداکشاوە. لاجانگی قاوەییە. برۆی سپییە و هەتا پاش ملی کشاوە. سەری کلکی سپییە و لە فڕیندا دیار دەکا. بەرزگی پنۆک پنۆک قاوەیی کاڵە. خاڵێکی زەردی کەم ڕەنگی لەسەر ملییە. بەباڕی ڕەنگی کاڵترە و خاڵی سەر ملی نییە. لە بەندەن و ڕەوەزی کێوان، لە شوێنی بەردەڵان و کەلاواندا دەژی. لە بەستێنی چۆمی ئیشکارۆ و زەویوزارانیش دەبینرێ. لە کونی بەرد و داراندا هێلانە ساز دەکا.(236)

چۆلەکە-ی گەردن زەرد(66)
گنجشک گلو زرد
Petronia xanthocollis
Moineau soulcie á gorge jaune
Sparrow Yellow-throated

١٢,٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. قاوەیی ئاماڵ بۆرە. خاڵێکی زەردی لە ملییە. دوو خەتی سپی و خاڵێکی سووروواشی لەسەر باڵی هەیە. کلکی قاوەییە و دندووکی ڕەشە. لەنێو دار و پنچکی دەورە ئاوەڵە و زەویوزاران دەژی. لە کونی دار و دیواردا هێلانە ساز دەکا.(325)

## **تۆرەمەی چۆلەکەپەرچە** (13F)
Family SYLVIIDAE

* بۆری بن گوێنی

جۆرە باڵندەیەکی بچووکی، دندووک باریکی، بزۆزی، جڕ و جانەوەر خۆرن. نیشانەیەکی وایان نییە بۆ ناسینەوە. پەڕ و باڵیان زوو زوو دەگۆڕێ. دەنگ و



کردەوەیان کەرەسەیەکی باشە بۆ ناسینیان. زیاتر لەناو پنچکی کورتەباڵا یان لەسەر عەرز یان لەناو قامیشەڵان (جۆری Acrocephalus) هێلانە ساز دەکەن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگە ( بێجگە لە جۆری Sylvia) زیندەوار، جاڵجاڵووکە و شەیتانۆکە دەخۆن. بریتین لە: تانج زێڕین، چۆلەکەپەرچە، چۆلەکەپەرچەی باغی، چۆلەکەپەرچەی بچووک، چۆلەکەپەرچەی بچووکی داران، چۆلەکەپەرچەی برۆ سپی، چۆلەکەپەرچەی برۆ زەرد، چۆلەکەپەرچەی بەجیوەجیو، چۆلەکەپەرچەی بیابانی، چۆلەکەپەرچەی چاو سپی، چۆلەکەپەرچەی چەڵتووکان، چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی داران، چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی زەلان، چۆلەکەپەرچەی چەمان، چۆلەکەپەرچەی چیفچاف، چۆلەکەپەرچەی ڕۆژهەڵاتی زەلان، چۆلەکەپەرچەی ڕێ ڕێ، چۆلەکەپەرچەی ڕێ ڕێی زەلان، چۆلەکەپەرچەی زەردی زەلان، چۆلەکەپەرچەی زەلان، چۆلەکەپەرچەی ساوی، چۆلەکەپەرچەی سەر ڕەش، چۆلەکەپەرچەی سەر و لاجانگ ڕەش، چۆلەکەپەرچەی سەوز، چۆلەکەپەرچەی سینگ ڕێ ڕێ، چۆلەکەپەرچەی کلک پان، چۆلەکەپەرچەی کلک چەتری، چۆلەکەپەرچەی کلک درێژ، چۆلەکەپەرچەی گەورەی داران، چۆلەکەپەرچەی گەورەی زەلان، چۆلەکەپەرچەی لاوێنان، چۆلەکەپەرچەی لێڕەواران، چۆلەکەپەرچەی مل سپی، چۆلەکەپەرچەی نیقابدار، چۆلەکەپەرچەی نیقابداری بچووک، چۆلەکەپەرچەی نیقابداری هیوم.

تانج زێڕین(67)
تاج طلائی
Regulus regulus
Roitelet huppé
Goldcrest

٩ سانتیمێترە. لەچاو چۆلەکەپەرچەکانی تر خڕپنە. سەری زەردە و دوو هێڵی ڕەشی پێداهاتووە. کاکۆڵی نێرە نارنجییە و هی مێیە زەردی کاڵە. بەباڕی کاکۆڵی نییە. ئەو باڵندەیە پشتی سەوزی زەیتوونییە و بەرزگی زەردی ئاماڵ سپی. تەنیشتی شین دەچن؛ باڵی دوو خەتی سپی و خەتێکی پانی ڕەشی پێداکشاوە. لە لێڕەواران دەژی. زستانان لەسەر پەرژین و پنچکان دەبینرێ. هێلانەی بەچڵووکی دارانەوە هەڵدەواسێ.(256)

**چۆلەکەپەرچە (68)**

**سسک جنبان**
Scotocerca inquieta
Dromoïque du désert
Streaked Scrub Warbler

**١٠** سانتیمێترە. کلکی درێژە و سەری کلکی خڕە. شاپەڕی قەراغی کلکی سپییە. پشتی قاوەیی کاڵە و سەری ڕێ ڕێیە. بەرزگی سپییە. زیاتر کلکی قیت ڕادەگرێ. لەسەر عەرز چینە دەکا. دایم لە هاتوچۆ دایە. نەوی دەفڕێ. لەنێو بەردەڵان و پنچکی داوێنی بەردینی کێوان دەژی. لەنێو پنچکاندا هێلانە ساز دەکا. (255)

**چۆلەکەپەرچە-ی باغی (69)**

**سسک باغی**
Sylvia borin
Fauvette des jardins
Garden Warbler

**١٤** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی قاوەییە و بەرزگی کاڵترە. سەری خڕە و دندووکی ئەستوور و قوڵەیە. دەنگی خۆش و دایمی ئەو باڵندەیە نیشانەیەکە بۆ ناسینەوەی لە چۆلەکەپەرچەکانی تر. لاقی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. لەنێو لێڕەوار و بێشەڵان و باغ و باغچۆڵاندا دەژی. لەنێو پەرژین و پنچکان هێلانە دەکا. (254)

**چۆلەکەپەرچە-ی بچووک (70)**

**سسک کوچک**
Phylloscopus neglectus
Pouillot modeste
Plain Leaf Warbler

**٨,٥** سانتیمێترە. نیشانەیەکی تایبەتی نییە. کلکی کورتە. برۆی کاڵە. قاوەیی زەیتوونییە و لە پشت و زگیدا ڕەنگی زەرد نابینرێ. باڵندەیەکی یەکجار پڕ هاتوچۆیە. لەنێو بەرد و داری بەرزایی کێوان دەژی و زستانان دێتە شوێنی نزمتر. لەسەر پنچکان هێلانە ساز دەکا. (256)



**چۆلەکەپەرچە-ی بچووکی داران(71)**

**سسک درختی کوچک**
Hippolais caligata
Hypolaïs bottée
Booted Warbler

**١٢** سانتیمێترە. زۆر وەک چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی داران دەچێ بەڵام زۆر بچووکترە. خەتی کەم ڕەنگی بەسەرووی چاویدا کشاوە. دندووکی قوڵەیە. تەنیشت و خاڵیگەی زەردی کاڵە. سەری کلکی کاڵە. لەنێو باغ و پەرژین و پنچکاندا دەژی. هاوینان زۆر هەیە. (255)

**چۆلەکەپەرچە-ی برۆ سپی (72)**

**سسک ابرو سفید**
Lusciniola melanopogon
Lusciniole á moustaches
Moustached warbler

**١٢,٥** سانتیمێترە. زۆر وەک چۆلەکەپەرچەی ڕێ ڕێی زەلان دەچێ. سەری ڕەشە و برۆی سپین. لاجانگی قاوەیی توندە. گەرووی تەواو سپییە. پاش ملی قاوەیی ئاماڵ خورمایییە. کلکی قوڵە و خڕە، زۆر قیتی ڕادەگرێ. زۆر خۆ نەدیو دەکا. لەنێو گۆل و قامیشەڵان دەژی و لەسەر قامیشی کورت هێلانە ساز دەکا. (244)

**چۆلەکەپەرچە-ی برۆ زەرد (73)**

**سسک ابرو زرد**
Phylloscopus inornatus
Pouillot á grands sourcils
Yellow-browed Warbler

**٩,٥** سانتیمێترە. دوو خەتی سپی بەباڵیدا کشاوە. برۆی زەرد و کاڵە. پشتی سەوزە و بەرەو پاشەڵی وردە وردە کاڵ هەڵدەگەڕێ و ئاماڵ زەرد دەبێ. بەرزگی سپییە، کلکی کورتە. مێش و مەگەزان لە حەوا ڕاو دەکا. لە باغ و نێو پنچکان دەژی. (256)

چۆلەکەپەرچە-ی بەجیوەجیو (74)

سسک تالابی پرصدا
Acrocephalus stentoreus
Rousse rolle turdoïde d’Egypte
Warbler Clamorous Reed

١٨ سانتیمێترە. باڵ و پەڕی زەیتوونییە. سەری کلکی خڕە. دەنگی ئەو باڵندەیە باشترین نیشانەیە بۆ ناسینەوەی. ئاکاری وەک چۆلەکەپەرچەی گەورەی زەلان دەچێ. لە قامیشەڵان و قەراغ چەماوان دەژی. لەسەر پنچک و قامیشان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (255)

چۆلەکەپەرچەی-ی بیابانی (75)

سسک بیابانی
Sylvia nana
Fauvette naine
Desert Warbler

١١٫٥ سانتیمێترە. ڕەنگی خاکییە. نیشانەیەکی بەرچاوی نییە؛ غەیری ئەوەی کلکی نارنجی ئاماڵ خاکییە و شاپەڕی کەناری سپین. لەنێو پنچکاندا خۆ حەشار دەدا. نەوی دەفڕێ. زۆرتر کلکی قیت ڕادەگرێ. لە بیابانی ویشک لەسەر پنچک و دارەگەزان دەژی و هێلانە ساز دەکا. (254)

چۆلەکەپەرچە-ی چاو سپی (76)

سسک چشم سفید
Sylvia hortensis
Fauvette orphée
Orphean Warbler

١٥ سانتیمێترە. زۆر وەک چۆلەکەپەرچەی سەر ڕەش دەچێ، بەڵام نێرەی گەورەتر و شاباڵی کەناری کلکی سپییە. سەری هەتا نزیک چاوی ڕەشە و بەرەو پاش ملی بۆر هەڵدەگەڕێ؛ هەروەها ملی سپییە. مێیەی ئامالْ قاوەییە و لە چۆلەکەپەرچەی سەر و لاجانگ ڕەش گەورەترە. چاوی کاڵترە و ژینگەشی فەرقی هەیە. باڕی ئەو باڵندەیە وەکوو چۆلەکەپەرچەی سینگ ڕێ ڕێ دەچێ، بەڵام کلکی کورتترە و تووکی سەری کلکی پڕ ڕەنگترە. لەسەر دار و نێو باغ و باغاتان بەتەنیا دەژی و لە چڵووکی دامێنی داران هێلانە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (254)



چۆلەکەپەرچە-ی چەڵتووکان (77)

سسک شالیزار
Acrocephalus agricola
Rousserolle isabelle
Paddy-field Warbler

١٢ سانتیمێترە. خەتی سپی وەک برۆ بەسەر چاویدا کشاوە. پشتی قاوەیی ئامالْ خورماییییە. پاشەڵی خورماییییە. بەرزگی سپی ئامالْ بۆرە. باڵی تاڕادەیەک خڕن. لەنێو زەل و قامیشەڵانی کەناری دەریاچان دەژی. لەسەر پنچکی کورتی نێو زەلاندا هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی چەمان (78)

سسک رودخانه‌ای
Locustella fluviatilis
Locustelle fluviatile
River Warbler

١٢٫٥ سانتیمێترە. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە. بەرزگی سپییە و سینگی ڕێ ڕێی قاوەیی کاڵە. کلکی خڕە و خورمایی ڕەنگ. لاقی سوورەتی کاڵە. زۆرتر خۆ نەدیو دەکا و بەسڵ و بەپارێز دەفڕێ. برۆی سپییە. لە جێی شەدار و بێشەڵان و گیا و گۆڵی چڕ دەژی. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی چیفچاف (79)

سسک چیفچاف
Phylloscopus collybita
Pouillot véloce
Chiffchaff

١١ سانتیمێترە. وەک چۆلەکەپەرچەی لاوێنان دەچێ، پەڕ و باڵی کەمێک چڵکنترە و بڕێک خڕپنەترە. بەدەنگیڕا دەناسرێتەوە. لاقی ئامالْ ڕەشە. پشتی قاوەیی زەیتوونی و بەرزگی سپی ئامالْ زەرد و لیمۆییییە. دایم باڵان لێک دەدا و کلکی دەجووڵێنێتەوە. لەسەر داران دەژی. لەنێو پنچکان لەنزیک هەرد هێلانە ساز دەکا. (256)

چۆلەکەپەرچە-ی ڕۆژهەڵاتی زەلان (80)

سسک تالابی خاوری
Acrocephalus dumetorum
Rousserolle des buissons
Blyth’s Reed Warbler

١٢,٥ سانتیمێترە. ئەو باڵندەیە یەکجار زۆر وەک چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی زەلان دەچێ، بەڵام پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. لە نزیکەوە بەپەڕ و باڵیڕا لە چۆلەکەپەرچەکانی دیکە جیادەکرێتەوە. دەنگی وەک چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی زەلان دەچێ، بەڵام خۆشتر و نزمترە. (244)

چۆلەکەپەرچە-ی ڕێ ڕێ (81)

سسک راهراه
Locustella naevia
Locustelle tachetée
Grasshopper Warbler

١٢,٥ سانتیمێترە. زۆرتر خۆ لە چاوان نەدیو دەکا. پشتی قاوەیی زەیتوونییە؛ جاری وایە مەیلەو زەرد. سەرپشتی ڕێ ڕێیە. شاقەڵی ڕێ ڕێی کاڵە. بەرزگی ڕێ ڕێی ئاماڵ سپاتە. سەری کلکی خڕە. لاقی سووڕەتین و زۆرتر ڕەنگ دەگۆڕن. باڵندەیەکی سڵە و کەمتر دەفڕێ. لەنێو گیاوگۆڵی زەلان، پنچکی ویشک و سەر پەرژینان دەژی. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی ڕێ ڕێی زەلان (82)

سسک تالابی راهراه
Acrocephalus schoenobaenus
Phragmite des joncs
Sedge Warbler

١٢,٥ سانتیمێترە. وەک چۆلەکەپەرچەی زەلان دەچێ، بەڵام برۆی سپییە و پشتی ڕێ ڕێیە و پاشەڵی خاکییە. بەرزگی ئاماڵ سپییە و کەلەکەی خورمایین. کلکی تاڕادەیەک تیژە. لەنێو قامیشەڵان و گیاوگۆڵی شوێنی شەدار دەژی و هێلانە لە شوێنی نەدیو ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (244)



چۆلەکەپەرچە-ی زەردی داران (83)

سسک درختی زرد
Hippolais icterina
Hypolaïs ictérine
Icterine Warbler

١٣ سانتیمێترە. چۆلەکەپەرچەیەکی خرپنەی سەوزی مەیلەو زەردە. پەڕ و شاباڵی بەباڕی ئاماڵ سپییە و بەڕەسیوی زەرد. بەرزگی ئەو باڵندەیە زەردە و پشتی مەیلەو بۆرە. لاقی بۆری ئاماڵ شینە. دندووکی گەورە و پانە. لای سەرووی دندووکی مەیلەو ڕەشە و لای خوارووی مەیلەو سووڕەتی. لەنێو باغ و بێشە و سەر پەرژینان دەژێ. لەجێی پەسیوی نێو پەرژینان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (253)

چۆلەکەپەرچە-ی زەلان (84)

سسک تالابی معمولی
Acrocephalus scirpaceus
Rousserolle effarvatte
Reed Warbler

١٢,٥ سانتیمێترە. پشتی یەک دەست قاوەیییە. پاشەڵی خورماییییە. بەرزگی سپییە و کەلەکەی زەردباوە. ڕەنگی لاقی دەگۆڕێن. بەهۆی دەنگییەوە لە چۆلەکەپەرچەی زەلان جوێ دەکرێتەوە. سەرجەم لەو باڵندەیە خورماییترە. کاتێ بەسەر ئاودا نەوی دەفڕێ کلکی پان دەکاتەوە و سەری شۆڕ ڕادەگرێ. لەنێو قامیشەڵان و گیاوگۆڵی قەراغ ئاوان دەژی و بەگەڵ هێلکە و جووجکە دەکەن. لەنێو پنچک و قامیشاندا هێلانەی هەڵاوسراو ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (244)

چۆلەکەپەچە-ی زەیتوونی داران (85)

سسک درختی زیتونی
Hippolais pallida
Hypolaïs pâle
Olivaceous Warbler

١٣ سانتیمێترە. دندووکی درێژە. نیوە دندووکی خوارێی مەیلەو زەردە. پشتی زەیتوونی مەیلەو قاوەیییە و وردەوردە بۆر هەڵدەگەڕێ. باڵی ڕەشە و سەری شاباڵی کاڵن. بەرزگی سپی بۆرە و تووکی ئاماڵ زەردی پێوە دیارە. گەرووی سپیترە. بەهاران بەرزگی زەرد هەڵدەگەڕێ. ڕەنگی لاقی دەگۆڕێن. برۆی سپییە. لە باغ و زەویوزاران دەژی. لەسەر پنچک و پەرژینان هێلانە ساز دەکا. دەوری چاوی بەئاڵقەن. (253)

چۆلەکەپەرچە-ی زەیتوونی زەلان (86)

سسک تالابی زیتونی
Acrocephalus palustris
Rousserolle verderolle
Marsh Warbler

١٢.٥ سانتیمێترە. بەدەنگی دەناسرێتەوە. پشتی لە چۆلەکەپەرچەی زەلان زەیتوونیترە، چەنە و بەرچێلەی سپیترە. لاقی گۆشتنە. برۆی قوڵە و کاڵە و لەشی خڕینەترە. لەنێو گیاوگۆڵی کورتەبن و نێو کەندان و کەنار چۆماوان دەژی. لەنێو گیاوگۆڵدا هێلانە ساز دەکا. (244)

چۆلەکەپەرچە-ی ساوی (87)

سسک ساوی
Locustella Luscinioides
Locustelle Iuscinioide
Savi's Warbler

١٤ سانتیمێترە. وەک چۆلەکەپەرچەی زەلان دەچێ. کلکی پانە و شاپەڕی کلکی وردەوردە کورت دەبنەوە و ڕێ ڕێیە. پشتی قاوەیی مەیلەو سوورە. بەرزگی سپی مەیلەو قاوەییە و کەلەکەی قاوەیی مەیلەو خورمایین. برۆی قوڵەی کاڵی ئاماڵ زەردی هەیە. لەسەر پنچکی قامیشەڵان و زەڵاندا دەژی. زۆر هەیە. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی سەر ڕەش (88)

سسک سر سیاه
Sylvia atricapilla
Fauvette á tête noire
Blackcap

١٣.٥ سانتیمێترە. نێرە، تەپڵی سەری ڕەشە، پشتی قاوەیی ئاماڵ بۆرە، لاجانگ و بەرزگی تەواو بۆرە، بەباڕی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. مێیە، سەری قاوەیی مەیلەو سوورە و بەرزگی لەنێرە قاوەییترە، بەباڕی بەرزگی زەردە. لە شوێنی ڕووتی نێو لێڕواران کە پنچکی کورتی لێ ڕوابێ دەژی. لەسەر پەرژین و پنچکی دڕکاوی و داری هەمیشە سەوز هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (254)



چۆلەکەپەرچە-ی سەر و لاجانگ ڕەش (89)

سسک سر دودی
Sylvia mystacea
Fauvette de Ménétries
Menetries' Warbler

١٢ سانتیمێترە. باڵندەیەکی پڕ سەر و سەدایە. زۆرتر خۆ نەدیو دەکا. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. خڕایی کلکی ئاماڵ ڕەشە و شاپەڕی کەناری کلکی سپییە. نێوچاوان و سەر و لاجانگی نێرە تەواو ڕەشە و هی مێیە قاوەییە. نێرە و مێیە هەردوو دەوری چاویان بەئاڵقەیە و بەرزگیان سپییە. مێیە لە کەلەکاندا تووکی ئاماڵ زەردی هەیە. ئەو باڵندە زۆرتر خۆ لەنێو پنچکاندا حەشار دەدا و کاتی فڕین کلکی قیت ڕادەگرێ. لەبێشە و نێو پنچکان دەژی. هەروەها لەنێو ئەو دۆڵ و دەرانەی کە ئاویان پێدا دەڕوا دەبینرێ. لەنێو گیا و پنچکی چڕدا هێلانە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (253)

چۆلەکەپەرچە-ی سەوز (90)

سسک سبز
Phylloscopus nitidus
Pouillot vert
Green Warbler

١٠.٥ سانتیمێترە. پشتی ئاماڵ سەوزە. بەرزگی سپییە. سینگی زەردباوە و خەتی زەردی بەباڵیدا کشاوە. لاقی کاڵن. ئەو باڵندەیە بەدایم لەنێو پنچکاندا هاتوچۆ دەکا. لە لێڕەواری داوێنی شاخان دەژی. لەسەر عەرز لەنێو پنچکان هێلانە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (256)

چۆلەکەپەرچە-ی سینگ ڕێ ڕێ (91)

سسک سینه راه‌راه
Sylvia nisoria
Fauvette éperviére
Barred Warbler

١٥ سانتیمێترە. بەرزگی سپییە و تەواو ڕێ ڕێیە، لە مێیەدا ئەو ڕێ ڕێیە ڕوون نییە. پشتی نێرە قاوەیی مەیلەو بۆرە و پشتی مێیە قاوەییترە. ئەو باڵندەیە دوو خەتی سپی بەباڵیدا کشاوە، کەمێک لە شاپەڕی کەناری کلکی سپییە. چاوی زەردی ڕوونە. بەباڕی بەرزگی ئاماڵ زەردە. دندووک و کلکی ئەستوورە. زۆرتر خۆ نەدیو دەکا. کلک هەڵدەتەکێنێ. لەنێو بێشەڵان و پنچکی دڕکاوی و پەرژینان دەژی. لەنێو پنچکی دڕکاوی هێلانە ساز دەکا. هاوینان کەم هەیە. (254)

چۆلەکەپەرچە-ی کلک پان (92)

سسک دم پهن

Cettia cetti
Bouscarle de Cetti
Cetti's Warbler

١٣ سانتیمێترە. زۆرتر خۆ نەدیو دەکا هەر بۆیە کەم دەبینرێ و بەدەنگی دەناسرێتەوە. پشتی قاوەیی ئامال خورماییە. بەرزگی سپی مەیلەو بۆرە. کەلەکەی قاوەییە و وردە تووکی پاشەڵی ڕێ ڕێیە. برۆی قوڵەیە و سپی. کلکی پانە و سەر کلکی خڕە و زۆرتر قیتی ڕادەگرێ. ڕەنگی وەک بولبول دەچێ، بەڵام بچووکترە. لە نێو گیای کورتەبن و پڕ لە نزیک ئاوان یان قامیشەڵانان دەژی. هێلانە لە نەدیو لەنێو گیادا ساز دەکا. زۆر هەیە. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی کلک چەتری (93)

سسک دم چتری

Cisticola juncidis
Cisticole des joncs
Fan-tailed Warbler

١٠ سانتیمێترە. کاتی کورک بوون و جووجکە هەڵێنان لە ئاسمان باڵان لێک دەدا و بەدەنگی دەناسرێتەوە. وەکی دیکە خۆ نەدیو دەکا. خەتی دەوری چاوی هەیە. سەری پەڕ و باڵی خەتی زەردی مەیلەو سووری پێداکشاوە کە بوونەتە ڕێ ڕێ. گەروو و بەرزگی سپییە، سینگ و کەلەکەی ئامال خورماییە، کلکی کورت و خڕە و سەری شاپەڕی بەڵەکە لەنێو زەویوزار و چیمەن و زەلاندا دەژی. هێلانەی خۆی بەچڵووکی دارانەوە هەڵدەواسێ. زۆر هەیە. (243)

چۆلەکەپەرچە-ی کلک درێژ (94)

سسک دم دراز

Prinia gracilis
Prinia gracile
Graceful prinia

١٠ سانتیمێترە. کلکی لەچاو لەشی زۆر درێژە؛ قیت ڕایدەگرێ یان وەک چەتر دەیکاتەوە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. سەر و ملی ڕێ ڕێی قاوەییە. بەرزگی سپییە و کەلەکەی ئامال بۆرە. خاڵی ڕەش و سپی لە کلکیدا دەبینرێ. لەنێو باغ و پنچکی



زەویوزاران دەژی. لەنێو پنچکاندا هێلانە ساز دەکا. زۆر هەیە. (255)

چۆلەکەپەرچە-ی گەورەی داران (95)

سسک درختی بزرگ

Hippolais languida
Hypolaïs d'Upcher
Upcher's Warbler

١٤ سانتیمێترە. پشتی ئامال بۆرە. وەک چۆلەکەپەرچەی زەیتوونی داران دەچێ، کلکی لەهی ئەو گەورەتر و ڕەشتر و خڕترە؛ وەک چەتر هەڵی دەدا. لەنێو باغ و دارمێو و پنچک و داران دەژی. لەنێو پنچک و سەر داران هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (255)

چۆلەکەپەرچە-ی گەورەی زەلان (96)

سسک تالابی بزرگ

Acrocephalus arundinaceus
Rousserolle turdoïde
Great Reed Warbler

١٨.٥ سانتیمێترە. دندووکی درێژ و ئەستوورە. برۆی سپییە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. کەم وا هەیە خۆ نەدیو بکا. بەئازادی لەسەر دار و تەلان دەنیشێ. بەگەڵ هێلانە ساز دەکەن. نەوی فڕە و کاتی فڕین کلکی پان دەکات. لە قامیشەڵانی کەنار ئاوان هێلانە هەڵداوەسێ. (244)

چۆلەکەپەرچە-ی لاوێنان (97)

سسک بیدی

Phylloscopus trochilus
Pouillot fitis
Willow Warbler

١١ سانتیمێترە. زۆر وەک چۆلەکەپەرچەی چیفچاف دەچێ و تەنیا بەدەنگی لەو دەناسرێتەوە. پەڕ و باڵی کەمێک زەردترە؛ ئاخری هاوینان ئەو جیاوازییەش نامێنێ. لاقی قاوەیی ڕوونە. زۆرتر لەنێو پنچکان دەژی. (256)

چۆلەکەپەرچە-ی لێڕەواران (98)
سسک جنگلی
Phylloscopus sibilatrix
Pouillot siffleur
Wood warbler

١٢.٥ سانتیمێترە. پشتی سەوزی مەیلەو زەردە. سینگ و ملی زەردی گۆگردییە. بەرزگی سپییە. برۆی زەردباوە. باڵی بەرەنگی قاوەیی زەیتوونییە و سەری شاپەڕەکانی زەردە. باڵی شۆڕ ڕادەگرێ. لەنێو داران دەژی. (256)

چۆلەکەپەرچە-ی مل سپی (99)
سسک گلو سفید
Sylvia communis
Fauvette grisette
Whitethroat

١٣.٥ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی ئاماڵ قاوەییە. کلکی تاڕادەیەک درێژە و شاپەڕی کەناری کلکی سپین. باڵندەی نێرە سەری بۆری کاڵە و پایزان بۆری مەیلەو قاوەیی دەبێ. ملی تەواو سپییە و بەرزگی ئامال سوورەتییە. مێیە بۆری توندە و سەری ئامال قاوەییە. لە سینگیدا تووکی سوورەتی کاڵ هەیە. باڵندەیەکی نائارامە. کلکی قیت ڕادەگرێ و دایمە لەنێو پنچکاندا دێ و دەچێ. لەنێو پنچک و دڕکان دەژی. لەنێو پنچکان هێلانە ساز دەکا، هاوینان زۆر هەیە. (253)

چۆلەکەپەرچە-ی نیقابدار (100)
سسک نقابدار
Sylvia curruca
Fauvette babillarde
Lesser Whitethroat

١٣ سانتیمێترە. کلکی لە چۆلەکەپەرچەی مل سپی قوڵەتر و پشتی بۆرترە. تووکی دەوری چاوی ڕەشە و وەک پەچە دەچێ. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. خۆ نەدیو دەکا. لەنێو دار و پنچکی بەرز و پڕ دەژی. هاوینان زۆر هەیە. (253)



چۆلەکەپەرچە-ی نیقابداری بچووک (101)
سسک نقابدار کوچک
Sylvia minula
Fauvette babillarde des déserts
Desert Lesser Whitethroat

١٣ سانتیمێترە. وەک چۆلەکەپەرچەی نیقابدارە بەڵام پشتی قاوەیی مەیلەو خاکی کاڵە. دەم و چاوی ئامال ڕەش و سەری بۆری مەیلەو شینە. شاپەڕی کەناری کلکی تەواو سپییە. لە بیابانان لەنێو پنچکاندا دەژی. زۆر هەیە. (255)

چۆلەکەپەرچە-ی نیقابداری هیوم (102)
سسک نقابدار هیوم
Sylvia althaea
Fauvette babillarde de Hume
Hume’s Lesser Whitehroat

١٣ سانتیمێترە. وەک چۆلەکەپەرچەی نیقابدار دەچێ بەڵام پشتی قاوەییترە. کەلەکەی ئامال زەیتوونییە و سینگی ئامال سوورەتییە. دندووکی گەورە دیار دەکا. لە داوێنی بەردەڵانی کێوان دەژی و لەنێو ڕەوەزاندا هێلانە ساز دەکا. زۆر هەیە. (255)

## **تۆرمەی چەورووکە** (14F)
Family APODIDAE

* پاڵوانە (؟)، پەڕەمەساسە (؟)، تەڕنەبابیلە، تەیر، تەیرەکوێرە (؟)، تەیرەن ئەبابیل، چەورۆکە، خەنجەربال (؟)، شەمشیربال (؟)، کاردەپلە (؟)، کاردەپەلە (؟).

ئەو باڵندانە ڕواڵەتیان لە پەڕەسلێرکە دەکەن. بەدەنیان باریکە و باڵیان درێژە و وەک دەمە داس دەچێ. کلک و قاچیان کورتە. بەپۆل دەگەڕێن. زۆر تیژباڵن و لە هەموو باڵندەیەک زیاتر دەتوانن لە هەوادا بخولێنەوە. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن؛ بەئاوی زار گیاوگوڵ بۆ دروستکردنی هێلانە تەڕ دەکەن. بریتین لە: چەورووکە، چەورووکەی ئالپی، چەورووکەی بچووک، چەرووکەی بۆر.

چەورووکە (103)

بادخورک معمولی
Apus apus
Martinet noir
Swift

١٦ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی مەیلەو ڕەشە و باڵی درێژە. چەنەی ئاماڵ سپییە و کلکی کـورت و دوو هاچەیە. زیاتر لە هەوادا دەخـولێـتـەوە و تیـژباڵە. کـاتی کـورک بوون بەزریکە زریک لەسـەر خـانووبەران دەکـەونە دوای یەک. لە مـیـچی بەرهەیوان، کـونی ڕەوەزان و کونە داران هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (195)

چەوورووکە-ی ئاڵپی (104)

بادخورک کوهی
Apus melba
Martinet alpin
Alpine Swift

٢١ سانتیمێترە. (بەباڵی کراوە ٥٣ سانتیمێترە) لە چەوورووکە قاوەییترە. بەرزگی سپییە و خەتی قاوەیی بەسینگیدا هاتووە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. لە گرە بەردی شاخان، ڕەوەزی ڕووکاری دەریا و بن میچی خانووی بڵیندی چۆڵ دەبینرێ. هێلانەی فـینجانی شکڵە و لەکونە بەردان و مـیـچی خـانوواندا سـازی دەکـا. زیاتر بەتێکڕایی هێلانە چێ دەکەن. (195)

چەوورووکە-ی بچووک (105)

بادخورک کوچک
Apus affinis
Martinet á croupion blanc
Little Swift

١٢ سانتیـمێتـرە. پەڕ و باڵی تەواو ڕەشە. تەنیا چەنە و گەروو و شاقەلی سپـییـە. کلکی لەجیـاتی ئەوەی دوو هاچە بێ، خشـتـە. لە شـوێنی ئـاوالآی دەوروبەری شـار و گـوندان دەبینرێ. لە کـاول، لێـوارەی ڕەوەزان و مـیـچی هەیوانـان هێـلانە سـاز دەکـا. هاوینان زۆر هەیە. (207)



چەوورووکە-ی بۆر (106)

بادخورک دودی
Apus pallidus
Martinet pêle
Pallid Swift

١٦ سانتیمێترە. ڕەنگی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. ڕەنگی سپیایی گەرووی زۆرە. کەلەکەی خاڵی کاڵی تێدایە و سەرپەڕی شاباڵی لەبەدەنی کاڵترە. لە بەرمیچی هەیوان، کونی ڕەوەز و کونەداران هێلانە ساز دەکا. (195)

## تۆرەمەی دارەسمە (15F)
Family PICIDAE

* تەوتەبە (؟)، چکوچک (؟)، خـەنجـەردەم، خـەنجـەردەمـە، دارتورکنەک، دارتەقنە، دارتەقـینە، دارتەقـێنە، دارسم، دارکـڕۆک، دارکـڕۆکـە، دارکلۆرە، دارکـوب، دارکـوتـک، دارکوتکە، دارکوتە، دارکۆک، دارکـونکەرە، دارەکـەوە، کاکورک (؟)، کوتکوتۆک، مل گێڕە.

ئەو باڵـندانە لەسـەر دار دەژین، دندووکـیـان بەقـەوەت و تیـژە و داری پێ کـون دەکەن. زمـانیـان درێژە، لاقـیـان بەهێـزە، دوو قـامکـیـان لە پێشـەوەیە و دووی تریان لە دواوە. کلکیـــشـیـــان زۆر بەهێــزە و لە بەدار هەڵچـوون کـەلکی لێ وەردەگرن. نێـرە و مێیـەیان یەک ڕەنگە، زیاتری نێـرەکـان بەشێکی لەسـەریان سوورە. لە داردا کون سـاز دەکەن و هێـلانەی تێدا چێ دەکـەن. زۆرتر بەتەنیـا دەژین. مـێش و مـەگـەز و مـیـوە و دەنک و شـیـرەی داران دەخـۆن. بریتین لە: دارەسـمە، دارەسـمەی بلووچی، دارەسـمەی خـاڵخـاڵی باڵ سپی، دارەسـمەی خاڵخاڵی بچووک، دارەسمەی خاڵخاڵی گەورە، دارەسمەی خاڵخاڵی نێونجی، دارەسـمەی ڕەش، دارەسـمەی سـووریایی، دارەسـمەی شین، دارەسـمەی شـینی بەرزگ پووڵەکەیی.

دارەسمە (107)

دارکوب راەراە
Jynx torquilla
Torcol fourmilier
Wryneck

١٦ سانتیـمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. لە دوورەوە قـاوەیی ئاماڵ بۆر دەنوێنێ، بەرزگی کـاڵتـرە. پەڕ و باڵی ڕێ ڕێییـە. جارجار تووکی سەری قرژ دەبێ. لەسـەر عـەرز

چینە دەکا. بەدار هەڵدەچێ. لە باغ و باغات، ڕێزەداری کەنار زەویوزاران دەبینرێ. لە کونەدار و کونی خانوواندا هێلانە ساز دەکا. (205)

دارەسمە–ی بلووچی (108)

داركوب بلوچی
Dendrocopos assimilis
Pic du Sind
Sind pied Woodpecker

٢٠ سانتیمێترە. نێرە سەری تەواو سوورە بەڵام هی مێیە سوور نییە. وەک دارەسمەی سوورپایی دەچێ. خەتی ڕەشی کەنار گەروو و ملی کورتترە. شوێنی ژیانی هەر وەک دارەسمەی سوورپاییە؛ لەناو گەزەڵاناندا زۆرتر دەبینرێ. لە کونی داراندا هێلانە ساز دەکا. (206)

دارەسمە–ی خاڵخاڵی باڵ سپی (109)

داركوب بال سفید
Dendrocopos Leucopterus
Pic á ailes blanches
White-winged Spotted Woodpecker

٢٣ سانتیمێترە. هەروەک دارەسمەی خاڵخاڵی گەورە دەچێ بەڵام نێوچاوان و سەرباڵی سپیایی زۆرترە. بەرزگی تەواو سپییە. مێیە سوورایی سەری نییە. دەنگی لە هی دارەسمەی سوورپایی دەچێ. زیاتر لە دەوروبەری گوندان لەناو زەویوزاران دەبینرێ. (206)

دارەسمە–ی خاڵخاڵی بچووک (110)

داركوب كوچک
Dendrocopos minor
Pic épeichette
Lesser Spotted Woodpecker

١٤ سانتیمێترە. بچووکترین دارەسمەیە. پشتی ڕێ ڕێی ڕەش و سپییە. تووکی ژێرەوەی پاشەڵی سوور نییە. نێوچاوان، بەرزگ و لاجانگی ئاماڵ سپییە. نێرە سەری سوورە و مێیە سەری سپییە. بەباری سوورایی سەری نییە. ئەم باڵندەیە زۆرتر خۆ نەدیو دەکا. لەسەر چڵووکی داران دەژی. (206)



دارەسمە–ی خاڵخاڵی گەورە (111)

داركوب خالدار بزرگ
Dendrocopos major
Pic épeiche
Great Spotted Woodpecker

٢٢ سانتیمێترە. بەپشتی ڕەش و شانی سپی و ژێر ئاتەگی سوور لە دارەسمەی خاڵخاڵی بچووک دەناسرێتەوە. لەسەر لاجانگی سپی خەتی ڕەشی پێداکشاوە. بەرزگی سپی واشە. نێرە خاڵێکی سووری لە تەپلی سەری دایە؛ بەباری تەواوی سەری سوورە. ئەم باڵندەیە کەم وا هەیە لەسەر عەرز چینە بکا، زیاتر لەسەر دارانە. (206)

دارەسمە–ی خاڵخاڵی نێونجی (112)

داركوب سر سرخ
Dendrocopos medius
Pic mar
Middle Spotted Woodpecker

٢١ سانتیمێترە. سەری تەواو سوورە و تاڕادەیەک هەر دەڵێی کاکۆڵی هەیە. سپیایی لاجانگ و ملی زۆرە و خەتی ڕەشی لاملی باریکە. دەوری چاوی ڕەش نییە. سەری کاڵ دەنوێنێ و بەرزگی سپییە و لاتەنیشتی ڕێ ڕێیە. باڵی خەتی پانی ڕەش و سپی پێداکشاوە. مێیە بۆر دەنوێنێ و سوورایی سەری کاڵترە. لەسەر داری بڵیند دەژی. هەر لە بەرزایی بۆ هێلانە دار کون دەکا. (206)

دارەسمە–ی ڕەش (113)

دار كوب سیاه
Dryocopus martius
Pic noir
Black Woodpecker

٤٥ سانتیمێترە. لە هەموو دارەسمەکان گەورەترە. پەڕ و باڵی یەکدەست ڕەشە. نێرە سەری بەکڵاوەی سوورە، بەڵام مێیە تەنیا خاڵێکی سووری لە پاشەستۆی هەیە. ئەم باڵندەیە چاوی زەردە و دندووکی کاڵە. لە کونی داری زۆر بڵیند هێلانە چێ دەکا. (205)

دارەسمە-ی سووریایی (114)

داركوب باغی
Dendrocopos syriacus
Pic syriaque
Syrian Woodpecker

٢٢ سانتیمێترە. هەر وەک دارەسمەی خاڵخاڵی گەورە دەچێ بەڵام ڕەشی لاجانگی کەمترە. هەر بۆیە سەری سپیتر دەنوێنێ. هەروەها سپیایی کلکی کەمترە بەڵام هی باڵی زۆرترە. سوورایی ژێر ئاتەگی کاڵترە. زۆرتر لە دەوروبەری گوند و زەویوزاراندا دەبینرێ. (206)

دارەسمە-ی شین (115)

داركوب سبز
Picus viridis
Pic vert
Green Woodpecker

٣١ سانتیمێترە. پشتی سەوزی ئاماڵ ڕەشە و بەرزگی سەوزی مەیلەو بۆرە. سەری سوورە و پاشەڵی زەردە. دەوری چاوی ڕەشە؛ ژێر چاوی خەتی سووری پێداهاتووە. بەباری کاڵ و ڕێ ڕێیە. زیاتر لەسەر عەرز پێڕۆ دەکا؛ مێروولان دەخوا. لە لێڕەوار و زەوی بەدار دەبینرێ. لە کونی داردا هێلانە ساز دەکا. (205)

دارەسمە-ی شینی بەرزگ پوولەکەیی (116)

داركوب سبز راهراه
Picus squamatus
Pic écaillé
Scaly-bellied Woodpecker

٣٣ سانتیمێترە. پشتی سەوز و هەتا بەرەودوا دەچێ زەرد هەڵدەگەڕێ. باڵی قاوەیی مەیلەو سەوزە و خەتی زەردی پێداکشاوە. کلکی خەتی قاوەیی و سپی تێدایە. بەرزگی سپی ئاماڵ سەوزە و نەخش و نیگاری وەک پوولەکەی تێدایە. ئاڵقەی چاوی سپییە. نێرەیان سەری سوورە و هی مێیەیان ڕەشە. زیاتر لەسەر عەرز مێروولە دەخوا. لەسەر داری بەرز دەژی. لە کونی داردا هێلانە دەکا. (205)



## تۆرەمەی دارەوان (16F)
Family CERTHIIDAE

دارەوان (117)

دارخزک
Certhia familiaris
Grimpereau des bois
Tree Creeper

١٢ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگن. پشتی قاوەییە و خەتی ئاماڵ زەردی تێدایە. بەرزگی سپییەکی تۆڵخە. بەقنەقن دایمە بەداران هەڵدەچێ. لە لێڕەوار و باغان، هێلانەی خۆی لەنێو پێستی هەڵکەناوی داری کۆندا ساز دەکا. (316).

## تۆرەمەی دندووک سوورە (17F)
Family HAEMATOPODIDAE

دندووک سوورە (118)

صدف خور
Haematopus ostralegus
Huitrier pie
Oystercatcher

٤٢ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. بەڵەکە. دندووکی سوور و درێژ و مەیلەو زەردە. لاقی ئەستوورە. سەر و سینگ و پشتی ڕەشە. بەرزگی سپییە. سەر باڵی سپییە. کلکی بەڵەکە. لە قەراغ ئاوان، لە خیزەڵانی دەم چۆم و گۆلان دەژی. لەسەر تەپۆڵکە خیزی قەراخ ئاو وچان دەدا. (123)

## تۆرەمەی دەریابڕە (18F)
Family GAVIIDAE

* ماسی خۆر

ئەو باڵندانە گەورە و دندووک تیژن. لە مەلەوانیدا زۆر قابیلن، لاقیان قەوییە و بەلای پاشەلیان دایە. لەکاتی مەترسیدا خێرا دەچنە بن ئاو، زۆرتر لە ڕووناواندا دەژین، تەنیا بۆ هێلکە و جووجکە دێنە قەراغان، لە کاتی فڕیندا پشتیان کۆم دەکەن. باڵیان لەچاو لەشیان چووکترە. لەسەر هەرد هێلانە ساز

دەکەن. زیاتر ماسی دەخۆن. هەروەها لە شەیتانۆکە و کرم و مێشوولکە و جڕ و جانەوەر خۆ ناپارێزن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. کلکیان قوڵەیە؛ بەجۆرێ کە لە کاتی فڕیندا لاقیان لە کلکیان درێژتر دیاری دەکا. دوو جۆری ناسراوە: دەریا بڕەی گەروو ڕەش، دەریابڕەی گەروو سوور.

دەریابڕە-ی گەروو ڕەش (119)
غواص گلو سیاه
Gavia arctica
Plongeon arctique
Black-throated Diver

٥٨ هەتا ٦٧ سانتیمێترە. دندووکی ڕاست و شووشە. سەری دندووکی ڕەشە. گەرووی خاڵێکی گەورەی ڕەشی تێدایە. مل و پشتی زنجیرییە واتا خەت خەتی ڕەش و سپی تێدایە. لەکاتی کورک بووندا سەر و پاش ملی بۆرە. (30)

دەریابڕە-ی گەروو سوور(120)
غواص گلو سرخ
Gavia Stellata
Plongeon catmarin
Red-throated Diver

٥٣ هەتا ٦٠ سانتیمێترە. دندووکی شووش و باریکە، تاڕادەیەک دەندووک بەرزە. سەری قیت ڕادەگرێ. لە کاتی کورک بووندا سەری بۆر دەبێ. گەرووی خاڵێکی گەورەی سووری لێیە کە لە دوورەوە ڕەش دەنوێنێ. پشتی ڕەشی مەیلەو قاوەییە. بەرزگی سپییە. (30)

## تۆرەمەی ڕەشیشە (19F)
Family TURDIDAE

ڕەنگاوڕەنگن، دەنگخۆشترین باڵندەکان لەناو ئەم تۆرەمەیە دان. دندووکیان تاڕادەیەک باریکە. لاقیان بەهێزە. لەم تۆرەمەیەدا چەند دەستە باڵندەی وێکنەچوو کۆبوونەتەوە کە بریتین لە: أ- بۆقژەکان، ب- بولبولەکان، پ- بووکە سوورەکان، ت- ڕەشیشەکان، ج- کلک سوورەکان، چ- کەڵەکەترەکان، ح- گابەڵەکەکان، خ- گەروو شینەکان.



أ- بۆقژەکان Thrushes
* قەشمەرە (؟)
ئەم دەستەیە بریتین لە: بۆقژەی بنەوشی، بۆقژەی کێوی.

بۆقژە-ی بنەوشی (121)
طرقه بنفش
Monticola solitarius
Merle bleu
Blue Rock Thrush

٢٠ سانتیمێترە. نێرەیان پەڕ و باڵی بۆری ئامال شینی توندە و زستانان ڕەش هەڵدەگەڕێ. مێیەیان پشتی قاوەیی مەیلەو شینە، بەرزگی کاڵترە و هەروەها خەتی قاوەیی ئامال بۆری تێدایە. ئەم باڵندەیە بەباڵی شۆڕەوە لە سەر بەردان هەڵدەنیشێ و هەر کە کەسێک لێی نزیک بۆوە، دەردەپەڕێ و بەفڕین دوور دەبێتەوە. بەتەنیا دەژی. لە بیابان، شوێنی بەردەڵان، داوێنی کێوان دەژی. لە کونە بەرد و ڕەوەز و خانووەاندا هێلانە ساز دەکا. (296)

بۆقژە-ی کێوی (122)
طرق کوهی
Monticola saxatilis
Merle de roche
Rock Thrush

١٩ سانتیمێترە. سەری کلکی ئەم باڵندەیە شێ ڕەنگە و ئەستوورایی کلکی قاوەییە. نێرەیان سەر و مل و شانی شینی ئامال قورقوشمی کاڵە، باڵی مەیلەو ڕەشە و بەرزگی نارنجی ئامال شێیە. زستانان بەهۆی پەیدابوونی خەتی ئامال زەردی دەوری پەڕەکانی، ئەو ڕەنگانە جوان دیار ناکەن، پەڕ و باڵی بۆری خاڵخاڵ دەبێ. مێیەیان پشتی پڕ لە خاڵ و جاری وایە نیشانەی سپیایی تێدایە. بەرزگی خاڵخاڵی زەردواشە. ئەم باڵندەیە بەتەنیا دەژی و بەدایم خۆ نەدیو دەکا. کلکی هەڵدەتەکێنێ. لە شوێنی ئاوالا، ناو بەردەڵان و داری کێوان دەژی. (296)

ب– بولبولەکان Nightingales

ئەم دەستەیە بریتین لە: بولبول، بولبولی خاڵخاڵ، بولبولی خورما، زرِە بولبول.

بولبول (123)

**بلبل**
Luscinia megarhynchos
Rossignol philoméle
Nightingale

* بلبل، بوبل، واف (؟)

١٦ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. کلکی شێی ئاماڵ قاوەییە، پشتی قاوەییە، بەرزگی قاوەیی ئاماڵ بۆرە کە لە زگ و ملیەوە سپی دەبێ. بەباری خاڵخاڵە. بەتەنیا دەژی و زیاتر خۆ نەدیو دەکا. لە جەنگەڵ، مێشەی شەدار و نێو پەرژینان دەژی. لەنێو پنچکە دروان لە نەدیو هێلانە ساز دەکا.
هاوینان زۆرە. (295)

بولبول–ی خاڵخاڵ (124)

**بلبل خالدار**
Luscinia Luscinia
Rossignol progné
Thrush Nightingale

١٦ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. وەک بولبولی ئاسایی دەچێ، بەڵام کلک و لەشی پڕ ڕەنگترە؛ قاوەیی ئاماڵ زەیتوونییە. لە نزیکەوە سینگی خاڵخاڵی ئاماڵ قاوەیی دەنوێنێ. کردەوەی وەک بولبولە. لە مێشەلانی پڕ و شەدار، لەناو گیاوگۆڵی زۆنگ و زەلان دەژی. (295)

بولبولی خورما (125)

**بلبل خرما**
Pycnonotus leucotis
Bulbul á oreillons blancs
White-eared Bulbul

١٨ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. سەر و مل و گەرووی ڕەشە، خاڵی سپی گەورەی لە لاجانگییە. پشتی قاوەیی کاڵە. بەرزگی بۆری چڵکنە. ژێر پاشەڵی زەردە.



کلکی ڕەشە و سەری کلکی سپییە. سەری نیمچە کاکۆڵی هەیە. بەجووت و پۆل دەگەڕێن. لەو شوێنانەی تاک تاک داری لێیە، لەنێو باغی خورما، لە زەویوزاران و تەنانەت لە شاران دەبینرێ. لەسەر پنچک و دار هێلانە ساز دەکا. (231)

زرِە بولبول (126)

**دم چتری**
Cercotrichas galactotes
Agrobate roux
Rufous Bush Chat

١٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. لەشی باریک و قاچی درێژە. کلکی شێ ڕەنگە؛ وەک چەتر هەڵی دەدا، سەری بەڵەکە. پشتی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. برۆی ئاماڵ سپییە. بەرزگی بەڕەنگی خاکییە. لەسەر پنچکان کە هەڵدەنیشێ باڵان کەمێک شۆڕ ڕادەگرێ و کلکی قیتی دەجوولێنێتەوە. لەنێو باغ، دارە مێو، دارخورما و دار زەیتوونان دەژی. لەنێو پەرژین و سەر دارەگەز هێلانە دەکا. هاوینان زۆرە. (295)

پ– بووکە سوورەکان Robins

ئەم دەستەیە بریتین لە: بووکەسوورە، بووکەسوورەی ئێرانی.

بووکەسوورە (127)

**سینە سرخ**
Erithacus rubecula
Rouge-gorge familier
Robin

١٣٫٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. سینگ و مل و نێوچاوانی نارنجییە، پشتی قاوەیی زەیتوونییە، بەرزگی ئاماڵ سپییە. کلکی قاوەیی توندە. بەباری ڕەنگی نارنجییە و لەشی پڕە لەخەت و خاڵ. لەباغ، سەر پەرژین و مێشان دەژی. لە کون و نێو پەرژیندا هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (294)

بووکەسوورە–ی ئێرانی (128)

**سینە سرخ ایرانی**
Irania gutturalis
Irani á gorge blanche
White-throated Robin

١٧ سانتیمێترە. نێرەیان پشتی بۆری ئاماڵ شینە. لاجانگی ڕەشە. برۆ و گەرووی

سپییە. سینگ و تەنیشتی سووری نارنجییە، کلکی ڕەشە. مێیەیان ڕەشایی لاجانگی نییە. پشتی قاوەیی توندە و بەرزگی لەهی نێرە کاڵترە. ئەم باڵندەیە خۆ حەشار دەدا. لە لێرەواری بەڕوو، دۆڵ و نشێوی بەردەڵان کە جێ جێ پنچکی کورتی لێ ڕوابن دەژی. لە خوارەوەی پنچکان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (293)

ت- ڕەشێشەکان Thrushes

بریتین لە: ڕەشێشە، ڕەشێشەی باغی، ڕەشێشەی باڵ سوور، ڕەشێشەی پشت شێ، ڕەشێشەی گەردن بەخاڵ، ڕەشێشەی گەورە، ڕەشێشەی مل ڕەش.

ڕەشێشە (129)

توکای سیاه

Turdus merula

Merle noir

Blackbird

٢٥ سانتیمێترە. نێرە لە مێیە گەورەترە و تەواو ڕەشە. دندووک و جەغزەی دەوری چاوی نارنجییە. مێیە پشتی قاوەیی توندە و بەرزگی قاوەیی کاڵ. ملی خاڵخاڵە و دندووکی قاوەیی کاڵ. بەباری تووکی خورمایی ڕەنگ و خاڵخاڵە. نێرە بەباری ڕەشی قاوەییە و دندووکی مەیلەو ڕەشە. ئەو باڵندەیە لەسەر عەرز چینە دەکا. کلکی وەک چەتر لێدەکا و قیتی ڕادەگرێ و بالان شۆڕ دەکا. لە لێرەوار و باغاندا دەژی. لەنێو پەرژین و میچی تەویلە و هۆلان هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر دەبینرێ. (296)

ڕەشێشە-ی باغی (130)

توکای باغی

Turdus philomelos

Grive musicienne

Song Thrush

٢٢ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. پشتی ئاماڵ قاوەیی و بەرزگی خاڵخاڵە. سینگ و تەنیشتی مەیلەو زەردی خاڵخاڵە. دەوری چاوی سپییە. لەسەر عەرز چینە دەکا. نێوبڕ هەڵدێ و ڕادەوەستێ. لە قەراغ ئاوەدانیان، لە باغچۆڵە و لێرەوار و نێو پەرژینان دەژی. لەنێو پنچک و پەرژین و خانووان هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر دەبینرێ. (313)



ڕەشێشە-ی باڵ سوور (131)

توکای بال سرخ

Turdus iliacus

Grive mauvis

Redwing

٢١ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. لە هەموو ڕەشێشەکان بچووکترە. وەک ڕەشێشەی باغی دەچێ بەو جیاوازییە کە برۆی کاڵە. سینگ و تەنیشتی ڕێ ڕێیە نەک خاڵخاڵ. زستانان لە دەوروبەری ئاوایییان دەبینرێ. هەم لە شوێنی ئاوەڵا و هەم لەناو جەنگەڵی چڕ دەژی. (313)

ڕەشێشە-ی پشت شێ (132)

توکای پشت بلوطی

Turdus pilaris

Grive litorne

Fieldfare

٢٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. سەر و دامێنی بۆرە. پشتی شێ ڕەنگە و کلکی ئاماڵ ڕەش. مل و سینگی ئاماڵ زەردە و خەتی ڕەشی تێدایە. تەنیشتی پڕ خاڵی ڕەش. لە فڕیندا پاشەڵی بۆری ئاماڵ شین و ژێر باڵی سپی دەنوێنێ. قیت و سڵ لەسەر عەرز هەڵدەنیشێ. زستانان لە شوێنی ڕووت، لەناو زەویوزاران و قەراغ پەرژینان چینە دەکا. (313)

ڕەشێشە-ی گەردن بەخاڵ (133)

توکای طوقی

Turdus torquatus

Merle á plastron

Ring Ouzel

٢٤ سانتیمێترە. نێرە پەڕ و باڵی ڕەشە. خەتێکی پانی سپی بەنێوان مل و سینگیدا هاتووە. مێیە ئاماڵ قاوەییە و خەتی سپی سینگی بۆر و باریکە. بەباری ئەو خەتەی نییە و تووکی پڕ خاڵە. توند دەفڕێ. کاتی مەترسی بەخوارەپێچیە دەفڕێتە پشت بەرد و ڕەوەزان، خاڵێکی گەورەی بۆری لەسەر شاباڵی هەیە. لەکێو و تەپۆڵکەی پڕ گیاوگۆڵ دەژی. لەنێو پنچک و بەرد لە نزیک جۆباران هێلکە دەکا. (296)

ڕەشیشە–ی گەورە (134)

تۆکای بزرگ
Turdus viscivorus
Grive draine
Mistle Thrush

**٢٤** سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. پشتی ئاماڵ بۆرە، بەرزگی خاڵخاڵە. لە فڕیندا ژێر باڵی سپی دیاری دەکا. پاشەڵی بۆری ئاماڵ قاوەییە. سینگی زەردواشە. ئەو باڵندەیە خۆ نەدیو دەکا. لە فڕیندا بەهێزە. بەباری پشتی خاڵخاڵە. لە باغی گەورە، باغی میوە و لێڕەواران دەژی. لەسەر دار هێلانە دەکا. پایزان بەگەل دەبینرێن. زستانان زۆر دەبن. (313)

ڕەشیشە–ی مل ڕەش (135)

تۆکای گلوسیاە
Turdus ruficollis
Merle á gorge noire
Black-throated Thrush

**٢٣** سانتیمێترە. نێرە سەر و مل و سینگی ڕەشە. بەرزگی سپییە. مێیە پشتی ئاماڵ قاوەییە. مل و سینگی مەیلەو سپییە و پڕە لە خاڵ و خەتی ڕەش. لە فڕیندا ژێر باڵی ئامال زەردی وەدەر دەکەوێ. زستانان لە قەراغ گوند و زەویوزاران دەبینرێ. (313)

ج– کلک سوورەکان Redstarts

بریتین لە: کلک سوورە، کلک سوورەی پشت شێ، کلک سوورەی ڕەش، کلک سوورەی کێوی.

کلک سوورە (136)

دم سرخ معمولی
Phoenicurus Phoenicurus
Rouge-queue á front blanc
Redstart

**١٤** سانتیمێترە. نێرە دەم و چاو و ملی ڕەشە. نێوچاوانی سپییە. پشتی بۆرە. لاتەنیشتی ئامالّ شێیە. پایزان ڕەشایی ملی کاڵتر دەبێ. مێیە پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە و بەرزگی زەرد دەنوێنێ. بەباری سینگی پنۆک پنۆکە و کلکی خورمایی ڕەنگە. لە ڕەوەز، خانووبەرە، بەردەڵانی قەدپاڵ و نێو دارەمێوان دەبینرێ. لە کونی دیوار، ڕەوەز و خانووان هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (294)



کلک سوورە–ی پشت شێ (137)

دم سرخ پشت بلوطی
Phoenicurus erythronotus
Rouge-queue d´ Eversmann
Eversmann’s Redstart

**١٤.٥** سانتیمێترە. نێرە بەهاوینان پەڕ و باڵی سەر و پاش ملی بۆری کاڵە و خەتێکی ڕەشی لە دەوری چاوی هەیە و هەتا ملی کشاوە. سینگ، بەرزگ، پشت و کلکی سووری کاڵە. هەر دوو باڵی ڕەشە و خاڵی گەورەی سپی تێدایە، مێیە پشتی قاوەیی ئامال بۆرە. کلک و پاشەڵی وەک نێرە دەچێ. باڵی ڕەنگ خۆڵینە. خاڵی گەورەی سپی هەیە. بەرزگی سپی ئامال بۆرە. لەنێو دار و پنچک و زەویوزاران دەبینرێ. زستانان زۆر هەیە. (293)

کلک سوورە–ی ڕەش(138)

دم سرخ سیاە
Phoenicurus ochruros
Rouge-queue noir
Black Redstart

**١٤** سانتیمێترە. نێرە و مێیە لە هەموو وەرزەکاندا کلکیان خورماییە و دەیلەرێنن. شاقەلیان خورماییە. ژێر باڵیان ڕەشە. نێرە تەواو ڕەشە و خاڵی سپی سەر باڵی هەیە. پایزان ڕەنگی کاڵ دەبێتەوە و خاڵی سپی باڵی نامێنێ. ڕەنگی مێیە و باری ئەم باڵندەیە وەک کلک سوورەیە، بەڵام تاریکترە. بەرزگیان بۆری تاریکە. لە ڕەوەز، خانووبەرە، قەدپاڵی بەردەڵانی کێوان و نێو دارە مێوان دەبینرێ. لە کونی دیوار، ڕەوەز و خانووان هێلانە دەکا. زستانان زۆر هەیە. (294)

کلک سوورە–ی کێوی (139)

دم سرخ کوهی
Phoenicurus erythrogaster
Rouge-queue de Güldenstädt
Güldenstädt’s Redstart

**١٧** سانتیمێترە. وەک کلک سوورە دەچێ، بەڵام لەو گەورەتر و کلک درێژترە. نێرە تەپڵی سەر و پاشەستۆی مەیلەو زەردە و خاڵی گەورەی سپی لەسەر باڵیەتی. مێیە وەک کلک سوورە دەچێ، بەڵام لەو گەورەترە. باڵی پنۆکی سپی تێدایە. پایزان دەوری شوێنە ڕەشەکانی لەشی نێرە زەرد هەڵدەگەرێ. لەسەر تەپۆڵکەی بەیار و ڕووتەنان و لەناو بەرد و ڕەوەزان دەبینرێ. لەنێو بەردان هێلانە ساز دەکا. (293)

## چ- کەڵەکەترەکان Wheatears

* حیساب کەرە، کەڵەگاترە

بریتین لە: کەڵەکەترە، کەڵەکەترەی بەڵەک، کەڵەکەترەی بەڵەکی باشووری، کەڵەکەترەی بەڵەکی ڕۆژهەڵاتی، کەڵەکەترەی بیابانی، کەڵەکەترەی پاشەڵ سوور، کەڵەکەترەی پشت سپی، کەڵەکەترەی دەشتان، کەڵەکەترەی سەر ڕەش، کەڵەکەترەی کلک سپی، کەڵەکەترەی گوێ ڕەش.

### کەڵەکەترە (140)

**چکچک کوهی**
Oenanthe oenanthe
Traquet motteux
Wheatear

١٤،٥ سانتیمێترە. پاشەڵی نێرە و مێیە سپییە و سەری کلکیان ڕەشە. نێرە وەرزی هێلکە و جووجکە پشتی بۆری ئاماڵ شینە، بڕۆی سپی و پانە. لاجانگ و گوێی ڕەشە (پاییزان قاوەییە). بەرزگی مەیلەو زەردە. پاییزان پشتی قاوەیی هەڵدەگەڕێ. بەدەنی ئامال زەرد دەبێ مێیە وەک نێرەی پاییزان دەچێ. ئەو باڵندەیە زۆر نائارامە و حەجمینی نییە. دایمە بۆ ئەو لاو ئەولا دێ و دەچێ و کلک پان دەکاتەوە و هەڵیدەتەکێنێ. لە چیمەن، لەوەڕگەی کوێستانان، ڕەوەزی شاخان و لە بیابانان دەژی. لە کونی بەرداندا هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبینرێ. (274)

### کەڵەکەترە-ی بەڵەک (141)

**چکچک ابلق**
Oenanthe pleschanka
Traquet pie
Pied Wheatear

١٤ سانتیمێترە. نێرە پشت و مل و سینگی ڕەشە. بەرزگی سپییە. سەر و پاش ملی هاوینان سپییە و زستانان ئامال بۆر. جاری وایە سپیایی شاباڵی قەراغ کلکی هەتا ئاخر دەڕوا، بەڵام هەمیشە سەری کلکی ڕەشە. شاپەڕی باڵی هاوینان ڕەش و زستانان دەوری مەیلەو زەرد دەبێ. مێیە سەر و پشتی قاوەیی و بەرزگی زەردواشە. کلکی سپییە و سەری کلکی ڕەشە. باڵی ڕەشە و خەتی ئامال سپی تێدایە. بڕۆی سپی دەچێ. ئەو باڵندەیە لەسەر پنچک و دار هەڵدەنیشێ وەک پەڕپەڵەکە ڕاوێ دەکا. لە زەوی بەردەڵان و داوێنی کێوان دەژی. لە کوندا هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبینرێ. (275)



### کەڵەکەترە-ی بەڵەکی باشووری (142)

**چکچک ابلق جنوبی**
Oenanthe Lugens
Traquet deuil
Mourning Wheatear

١٣،٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگن و وەک نێرەی کەڵەکەترەی بەڵەک دەچن، بەڵام سپیایی سینگیان هیچ کات زەرد هەڵناگەڕێ. تووکی ژێر پاشەڵی خورمایی ڕەنگە. لەکاتی فڕیندا خاڵێکی گەورەی سپی لە باڵیدا وەدیار دەکەوێ. لە دۆڵ و دەری تەنگی بەردەڵانی و داوێنی ڕەوەزی کوێستانان و بیابانی ئیشک دەژی. لەنێو بەردان یان کونی کەندالی چۆمان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبینرێ. (276)

### کەڵەکەترە-ی بەڵەکی ڕۆژهەڵاتی (143)

**چکچک ابلق خاوری**
Oenanthe picata
Traquet pie d’Orient
Eastern pied Wheatear

١٥،٥ سانتیمێترە. نێرەی ئەو باڵندەیە لە ئێراندا سێ جۆرە بینراوە. جۆری یەکەم (picata) سەر و پاش ملی و سینگی ڕەشە، بەڵام پاشەڵ و خوارەوەی سینگ و بەرزگی سپییە. جۆری دووەم (Capistrata) وەک جۆری یەکەمە، بەڵام تەپڵی سەری سپی ئامال بۆرە و جۆری سێهەم (opistholeuca) بەرزگی هەموو ڕەشە. مێیەی هەرسێک جۆر قاوەیی خاکییە. پاشەڵی سپییە. لە زەوی بەردەڵان و ڕەوەزی بەپنچک دەژی. لە بەستێنی چەمی ئیشکدا دەبینرێ. لە کونی بەردان هێلانە ساز دەکا. (293)

### کەڵەکەترە-ی بیابانی (144)

**چکچک بیابانی**
Oenanthe deserti
Traquet du désert
Desert Wheatear

١٤،٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی ئەو باڵندەیە کلکیان تەواو ڕەشە و قەراغ کلکیان سپییە. شاقەلیان سپییە. مێیە ملی سپییە و باڵەکانی قاوەییترن. نێرە مل و پەڕی شانی ڕەشە. پاییزان دەوری ڕەشایی ملی سپی هەڵدەگەڕێ. زستانان لە زەویزاری قەراغ بەیاران دەبینرێ. (275)

کەڵەکەترە-ی پاشەڵ سوور (145)

**چکچک دم سرخ**

Oenanthe xanthoprymna

Traquet á queue rousse

Red-tailed Wheatear

١٤ سانتیمێترە. نێرەی ئەو باڵندەیە سێ جۆری هەیە. لەهەر سێ جۆردا پشتی قاوەیی خاکییە و بەرزگی سپی بۆرە. پشتی بەلای پاشەڵێوە ئاماڵ زەردە. لە زۆرترین تۆرەمەی ئەو باڵندەیە (chrysopygia)دا، نێرە سەری ڕەش نییە و سپیایی دەوری کلکیشی نییە. دوو جۆری تری (Cummingi و Xanthoprymna) کە لە داوێنی ڕۆژئاوای کێوەکانی زاگرۆسدا بینراوە. دەم و چاو و ملیان ڕەشە و کەمێک سپیایی لەسەری شاباڵیاندا دەبینرێ. مێیەی هەر سێ جۆر وەک نێرەی جۆری یەکەم دەچێ. لە دۆڵ و دەرەکان و ڕەوەزی کەم گیاوگۆڵی کێوەکان دەژی. لەنێو بەردان هێلانە دەکا. (276)

کەڵەکەترە-ی پشت سپی (146)

**چکچک پشت سفید**

Oenanthe finschii

Traquet de finsch

Finsch's Wheatear

١٤.٥ سانتیمێترە. نێرە سەر و پشتی هەتا دەگاتە کلکی سپییە. سەری کلکی ڕەشە. دەوری چاو و مل و باڵی ڕەشە. سینگ و بەرزگ و پاشەڵی سپی تۆڵخە. مێیەی ئەو باڵندەیە وەک مێیەی کەڵەکەترەی گوێ ڕەش دەچێ، بەڵام پەڕ و باڵی بۆری ئاماڵ زەردە. لە داوێنی ڕەوەز و بەردەڵانان، لە تەپۆڵکە و زەوی چانراو دەژی. لەنێو بەرد و کونان هێلانە دەکا. (293)

کەڵەکەترە-ی دەشتان (147)

**چکچک دشتی**

Oenanthe isabellina

Traquet isabelle

Isabelline Wheatear

١٦ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. سەر و دندووکی لەچاو ئەوانی دیکە گەورەتر دیاری دەکا. کلکی بۆری کاڵە. ڕەنگی ئەو باڵندەیە تا ڕادەیەک بۆر و ڕەشایی باڵی کاڵە. هەڵاتنی لەسەر عەرز لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاوازی هەیە. لەدەشت و بەیار و داوێنی کێوان دەژی. زستانان لە شوێنی خیزەڵان دەبینرێ. (275)



کەڵەکەترە-ی سەر ڕەش (148)

**چکچک سر سیاه**

Oenanthe alboniger

Traquet de Hume

Hume's Wheatear

١٦.٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. سەر و پشت و باڵی ڕەشی ئاماڵ شینە. سینگ و بەرزگ و پاشەڵی سپییە. بەباڕی تووکی ڕەشی ئەو باڵندەیە سوورگوێزییە. لەسەر تەپۆڵکەی بەردەڵانی و بەیار و دۆڵ و دەرەی کێوان دەژی. بەدەگمەن دێتە دەشتایی. لەنێو بەردان هێلانە ساز دەکا. (276)

کەڵەکەترە-ی کلک سپی (149)

**چکچک دم سفید**

Oenanthe monacha

Traquet á capuchon

Hooded Wheatear

١٧ سانتیمێترە. دندووکی لەوانی دیکە درێژترە. نێرەی ئەو باڵندەیە سەری سپییە. دەوری چاو و مل و سینگ و باڵی ڕەشە. بەرزگ و دامێنی سپییە. کلکی ڕەشە و دەوری کلکی سپییە. مێیە بۆری ئاماڵ زەردە. کلکی قاوەیی توندە و دەوری کلکی مەیلەو زەرد یان سپی چڵکنە. ئەو باڵندەیە زۆر کەم هەیە. لە دۆڵ و دەرەی دوورە دەست و بەردەڵان دەژی. (276)

کەڵەکەترە-ی گوێ ڕەش (150)

**چکچک گوش سیاه**

Oenanthe hispanica

Traquet oreillard

Black-eared Wheatear

١٤.٥ سانتیمێترە. نێرەیان دوو جۆرە. جاری وایە خەتی پان و ڕەشی دەوری چاو و سەر لاجانگی هەیە، ملی سپییە. جاری واشە ڕەشایی سەر دەم و چاوی هەتا ملی دادەگرێ. لەشی زەردی ئاماڵ بۆرە کە بەلای پاشەڵێوە سپی هەڵدەگەڕێ. بەرزگی سپی واشە. باڵ و شانی تەواو ڕەشە. ئەو باڵندەیە پایزان مەیلەو زەرد دەبێ. مێیەی وەک کەڵەکەترە دەچێ، بەڵام لاجانگی بۆرتر و باڵی ڕەشتر و پاشەڵی سپیترە. لەسەر دار هەڵدەنیشێ. لە داوێنی بەردەڵانی کێوان و ئەو شوێنانەی تاک و تەرا داری لێ بێ دەژی. لە کونی دیوار و بەردان هێلانە ساز دەکا. (275)

ح- گابەڵەکەکان Stonechats

بریتین: لە گابەڵەکە، گابەڵەکەی باڵ بەڵەک، گابەڵەکەی ڕێ ڕێ.

گابەڵەکە (151)

چک

Saxicola torquata

Traquet pâtre

Stonechat

۱۲.٥ سانتیمێترە. نێرە سەر و ملی ڕەشە و تۆقی ملی سپییە و خەتێکی سپی بەباڵیدا کشاوە. پشتی ڕەشی ئاماڵ بۆرە و پاشەڵی بۆر دەنوێنی. کلکی ڕەشە. سینگی مەیلەو زەردە و ژێر پاشەڵی زەردی تولخە. باڕ و مێیە پشتیان قاوەییە و ڕێ ڕێی ڕەشە. سپیایی پاشەڵیان نییە. لەسەر پنچک و سیمی دارتێلان هەڵدەنیشێ و کلک و باڵی هەڵدەتەکێنێ. لە زەل و زۆنگ و نێو پنچک و زەویوزاران دەژی. لەنێو گیا و بن پنچکان هێلانە دەکا. (274)

گابەڵەکە-ی باڵ بەڵەک (152)

چک ابلق

Saxicola caprata

Tarier pie

Pied Stonechat

۱۲.٥ سانتیمێترە. نێرە و پەڕ و باڵی تەواو ڕەشە. خاڵێکی سپی گەورەی لە سەر باڵە. پاشەڵ و بەرزگی سپییە. پایزان پەڕی دەورەی دەبێتە خورمایی. مێیە قاوەیی خاکییە. پاشەڵ و تووکی سەر کلکی قاوەیی ئاماڵ نارنجییە. باڵ و کلکی قاوەیی توندە. پایزان قەراغی بۆر هەڵدەگەڕێ. لەنێو پنچکی زەوییان. دەشت و داوێنی کێوان دەژی. لەنێو پنچکاندا هێلانە دەکا. (293)

گابەڵەکە-ی ڕێ ڕێ (153)

چک بوتەای

Saxicola rubetra

Traquet tarier

Whinchat

۱۲.٥ سانتیمێترە. وەک مێیەی گابەڵەکە دەچێ. چاوی کەوتوونە نێو خەتێکی سپی. خاڵی لەسەر کلکی هەیە. لاجانگ و سەر و پشتی نێرە ڕێ ڕێیە. خەتی سپی



بەچاویدا کشاوە. باڵی ڕەشە و خاڵی سپی تێدایە. سینگ و ملی ئاماڵ زەردە. مێیە ڕەنگی ڕوونترە و خەتی چاوی مەیلەو زەردە. خاڵی سپی سەر باڵی بچووکترە. بەباڕی خاڵی سپی سەر باڵی نییە. لە زۆنگ و زەل و نێو پنچک و زەویوزاران دەژی. لەنێو گیاو بن پنچکان هێلانە ساز دەکا. (274)

خ- گەرووشینە Bluethroat

گەرووشینە (154)

گلو آبی

Luscinia svecica

Gorgebleue

Bluethroat

١٤ سانتیمێترە. وەک کلک سوورە دەچێ، بەڵام زۆربە کلکی پان دەکاتەوە و هەڵیدەتەکێنێ. نێرە بەهاران ملی شین دەنوێنی. دوو خەتی ڕەش و قاوەیی ئەو شینایییە لە سینگی جوێ دەکاتەوە. پایزان ملی شین بەڵەکە. مێیە ملی سپییە و دێغی ڕەشی لە دەوری هەیە. بەباڕی قاوەیی ڕێ ڕێیە و ئەستوورایی کلکی خەنەییە. لە مێشەڵان و گیاوگۆڵی ناو زەل و زۆنگ و پەرژینی چڕ دەژی. لەسەر سەوڵ و بی و ناو پنچکی زەلان هێلانە دەکا. زستانان زۆر دەبینرێ. (294)

## تۆرەمەی ڕەوڕەوە (20F)
Family CHARADRIIDAE

* ڕاوراوێلکە

لە تەنکاوان دەبن. دندووکیان تیژە. توند دەفڕن. پێڕۆن. کاتی چینە سەر و کلکیان زوو زوو دەجووڵێننەوە. زۆربەیان کۆچەرین و بەپۆل دەگەڕێن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر عەرز لە ڕووتەن هێلانە ساز دەکەن. جووچکەیان هەر کە لە هێلکە هاتنەدەر دەتوانن هێلانە بەجێ بێڵن. دانەوێڵە و گیانلەبەری ورد دەخۆن. بریتین لە: بەردگێرە، دەیدومەک، ڕەوڕەوە بۆرە، ڕەوڕەوە زێڕە، ڕەوڕەوە زێڕەی ئاسیایی، ڕەوڕەوەی بچووک، ڕەوڕەوەی خیزێ، ڕەوڕەوەی سینگ شێ، ڕەوڕەوەی قرژاڵگر، ڕەوڕەوەی کێوی، ڕەوڕەوەی گەردن بەخاڵی بچووک، ڕەوڕەوەی گەردن بەخاڵی گەورە، زیقاوە، زیقاوەی دەشتێ، زیقاوەی کلک سپی.

بەردگێڕە (155)

**سنگ گردان**
Arenaria interprres
Tournepierre á collier
Turnstone

**٢٢** سانتیمێترە. باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە. لاقی کورت و نارنجییە. دندووکی ڕەش و قوڵە و تیژە. هاوینان پشتی بەڕەنگی شێی توندە و خاڵی ڕەشی تێدایە. سەری بەڵەکە. زگی سپییە و بەرسینگی ڕەشە. زستانان قاوەیی ئاماڵ بۆر دەبێ و گەرووی پتر سپی هەڵدەگەڕێ. لەکاتی چینەدا بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنی شتی وەک بەرد و گوێماسیلکە هەڵگێڕ وەرگێڕ دەکا. لە خیزەڵان و قەراغ دەریا دەبینرێ. (124)

دەیدومەک (156)

**دیدومک**
Vanellus indicus
Vanneau de I’Inde
Red-Wattled Lapwing

**٣١** سانتیمێترە. سەر، مل و بەرسینگی ڕەشە. لاجانگی سپییە. پشتی قاوەیی توندە، ئەم قاوەییە لە باڵیدا ئاماڵ سوور دەبێ. زگی سپییە، هەروەها کلکیشی سپییە و سەر کلکی ڕەشە. لە پێش چاویدا زیادە گۆشتێکی سوور خۆ دەنوێنێ. دندووکی سوورە و سەری دندووکی ڕەشە. لاقی زەردە. زیاتر بەجووت دەبینرێن. لە قەراغ ئاوی شیرن و کەشاوان دێنە بەرچاو. لەسەر عەرز لە جێی ڕووت هێلانە ساز دەکا. (148)

ڕەوڕەوە بۆرە (157)

**سلیم خاکستری**
Pluvialis squatarola
Pluvier argenté
Grey plover

**٢٧** سانتیمێترە. کاتی هێلکەکردن و کورک بوون بەرزگی ڕەشە و پشتی مەیلەو سپییە. لە تەواوی ساڵدا بەدەنی پتەو، دندووکی ئەستوور، چاوی گەورە، پەڕەکانی بن باڵی ڕەشن. پاشەڵ، کلک و خەتی باڵی سپییە. نێرە هاوینان خاڵی سپی لەسەر پشتیدا دەبینرێ؛ کەچی زستانان بۆری مەیلەو قاوەییە. ئەم باڵندەیە بەباری زەردباوە. لە قەراغ تەنکاو و بەستێنی خیزەڵانی دەریادا دەبینرێ. (124)



ڕەوڕەوە زێڕە (158)

**سلیم طلائی**
Pluvialis apricaria
Pluvier doré
Golden plover

**٢٧** سانتیمێترە. پشتی ڕەشە و خاڵی خەنەیی تێدایە. هاوینان بەرزگ و سینگ و ملی هەتا دەگاتە دندووکی ڕەشە. لە پاشەڵێوە خەتێکی سپی دەست پێدەکا هەتا سەر برۆی. ئەو خەتە سپییە ڕەنگی پشت و زگی لێک جوێ دەکاتەوە. زستانان مل و بەرسینگی سپی هەڵدەگەڕێ. لە زەویوزار، شەت و ئاودڕ و قەراغ دەریا دەبینرێ. (124)

ڕەوڕەوە زێڕە–ی ئاسیایی (159)

**سلیم طلائی خاوری**
Pluvialis dominica
Pluvier doré asiatique
Asiatic Golden plover

**٢٤** سانتیمێترە. لە ڕەوڕەوە زێڕە بچووکتر و کزترە. ژێرباڵی شێ باوە، تووکی قووڵایی بن باڵی بۆرە. هاوینان سەر پشت و بەرزگی ڕەشایی زۆرترە. زۆرتر لە بەردەڵانی قەراغ دەریادا دەبینرێ. (124)

ڕەوڕەوە–ی بچووک (160)

**سلیم کوچک**
Charadrius alexandrinus
Gravelot á collier interrompu
Kentish Plover

**١٦** سانتیمێترە. جیاوازی لەگەڵ ڕەوڕەوەی گەردن بەخاڵی بچووک ئەوەیە کە: بەرزگی کاڵترە، لاوازترە، لاق و دندووک و قەیتانی دەوری چاوی ڕەشترە. دوو خاڵی گەورە و ڕەشی لە لاملیەتی. نێرە برۆی سپییە، نێوچاوانی خورمایی ڕەنگە و خاڵێکی ڕەشی تێدایە. مێیە کاڵترە، خاڵی مەیلەو قاوەیی لەلاملیەتی، نێوچاوانی ڕەش نییە. ئەم باڵندەیە لاقی ڕەشە. لە قەراغ دەریا و دەریاچەی سوێر دەبینرێ. لە تەنکاو و خیزەڵانان دەبی و هەر لەو شوێنانەش هێلانە ساز دەکا. (133)

ڕەوڕەوە–ی خیزی (161)

سليم شنی
Charadrius Leschenaultii
Gravelot de Leschenault
Greater Sand Plover

٢٢ سانتیمێترە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە، بەرزگی سپییە. دندووکی ڕەش و ئەستوورە. لاقی زەیتوونی توندە. نێرە لە کاتی هێلکە و جووجکە هەڵێنانی مێیەدا سینگی بەخاڵ دەبێ؛ خاڵەکەی شێ ڕەنگە. تووکی گوێی ڕەش دەبن، خەتێکی ڕەشی لە نێوچاوانی پەیدا دەبێ. مێیە خاڵی سینگی کاڵترە. زستانان نێرە و مێیە وێک دەچن. بەباڕی پشتی کاڵترە و تووکی دەورەی سینگی شێ ڕەنگە. لە خیزەڵان قەراغ چۆمان دەبینرێ. (148)

ڕەوڕەوە–ی سینگ شێ (162)

سليم سينه بلوطی
Charadrius asiaticus
Gravelot asiatique
Caspian Plover

١٩ سانتیمێترە. باریکە، لاق و ملی تاڕادەیەک درێژن نێوچاوانی کاڵ و برۆی قاوەییە. هاوینان سینگی قاوەیی سووربـاوە؛ بەلای بەرزگیدا ڕەشە. لە زستاندا ڕەنگی سینگی کاڵ دەبێتەوە و بەحاڵ دیاری دەکا. لە شۆرەکات، بیابان و ناو زەویوزاریشدا دەبینرێ. زۆرتر لە قەراغ ئاو دەبێ. (124)

ڕەوڕەوە–ی قرژاڵگر (163)

سليم خرچنگ خور
Dromas ardeola
Pluvier crabier
Crab Plover

٣٦ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. پەڕ و باڵی بەڵەکە. سەری تەواو سپییە. دندووکی ڕەش و ئەستوور و درێژە. لاقی ئاماڵ بۆر و درێژە. بەپۆل لە قەراغ دەریا و زەل و گۆلان دەژین. لە کوناندا هێلکە دەکا. (148)



ڕەوڕەوە–ی کێوی (164)

سليم کوهی
Eudromias morinellus
Pluvier guignard
Dotterel

٢١ سانتیمێترە. نێرە لە مێیە بچووکترە. لە مابەینی سینگ و زگیدا خەتێکی سپی پێداهاتووە. بەرزگی شێ ڕەنگی ئاماڵ نارنجییە. سەری ڕەشە. برۆی سپییە. زگی ڕەشە، پاشەڵ و کلکی سپییە. چ لە وەرزی زستاندا و چ بەباڕی برۆی بۆرە و بەرزگی ئاوا ڕەنگاوڕەنگ نییە؛ تەنیشت و سینگی قاوەییە. زستانان زۆرتر لە خیزەڵان، گۆل، شێوەرد و لەوەڕگاندا دەبینرێ. (124)

ڕەوڕەوە–ی گەردن بەخاڵی بچووک (165)

سليم طوقی کوچک
Charadrius dubius
Petit gravelot
Little Ringed Plover

١٥ سانتیمێترە. وەک ڕەوڕەوەی گەردن بەخاڵی گەورە دەچێ، بەڵام ئەمەیان خەتی سپی و لاقی ئاماڵ زەردە. مابەینی سەر و نێوچاوانی خەتی سپی پێداهاتووە. دەنگ و شوێنی ژینیشی لەگەڵ گەورەکەیان فەرقی هەیە. لە نزیکەوە ئاڵقەی زەردی چاوی دەبینرێ. بەباڕی خاڵی سینگی قاوەییە. لە قەراغ شیرناوان بەتایبەت لەسەر دوڕگە خیزەڵانەکانی ناو ڕووبارەکاندا دێن و دەچن. زستانان لەسەر خیزی قەراغ دەریا دەبینرێ. (133)

ڕەوڕەوە–ی گەردن بەخاڵی گەورە (166)

سليم طوقی
Charadrius hiaticula
Grand gravelot
Ringed Plover

١٩ سانتیمێترە. زۆر وشیار و وریایە. خرپن و قەڵەوە. گەردنی بەخاڵە (خاڵی ڕەش). لاقی نارنجییە. زۆر چوست و چالاکە. پشتی سوورگوێزییە. ملی سپییە. دەوری چاوی ڕەشە. نێوچاوانی سپییە و کەمێک زەقە. دندووکی نارنجییە و سەری دندووکی ڕەشە. خەتی سپی بەباڵیدا هاتووە. بەباڕی پشتی قاوەیی ڕەنگە، خاڵی گەردنی قاوەیی ڕەش باوە، ئەم باڵندەیە لاقی زەرد و سەری کلکی سپییە. لە تەنکاوی خیزەڵان و گۆلاوان دەبینرێ. (133)

زیقاوه (167)

خروس کولی
Venellus Vanellus
Vanneau huppé
Lapwing

* جیقۆله (؟)، دالّدالّەکۆسە (؟)، داوداوەکۆستە (؟)، داوداوەکۆسە (؟)، داوەکۆستە (؟)، زیرزیقاوله، زیرقاوله، زیقاو، زیقاوله، زیقاوله شامی، زیقاولّە، زیقزیقاوه، زیقوله، قی قی داوکه (؟)، قی قی ڕەجو (؟)، کەلّەشێری مەرزە (؟).

۳۰ سانتیمێتره. پشتی ڕەشی ئامالّ شینه، بەرزگی سپییه، پەڕ و بالّی بریقەی دێ. کاکۆلّی قیت و درێژه، لاجانگ و سەری کلکی بەلّەکە. لەکاتی فڕیندا ڕاست ناڕوا. ناوەکەی لە دەنگی گیراوە. هێلکەی خالّخالّ و بۆره. ئەگەر گیانلەبەرێک لە هێلانەی نزیک بێتەوە دەست دەکا بەزیقەزیق و شالاّوی بۆ دێنێ و هەتا دووری نەخاتەوە لێی نابێتەوە. لەناو زەویوزار، قەراغ ئاوگر و تەنکاوان دەبینرێ. هەر لەو شوێنانەش هێلانە دەکا. (123)

زیقاوه-ی دەشتێ (168)

خروس کولی دشتی
Vanellus gregarius
Vanneau sociable
Sociable Plover

۲۹ سانتیمێتره. لاقی درێژه. لە دوورەوە ئامالّ بۆر دەنوێنێ. سەری ڕەشە، برۆی سپییه، سەری بالّ و کلکی ڕەشە. هاوینان ڕوومەت و خوارەوەی ملی ئامالّ زەرد دەبێ و هەروەها سینگ و پشتی بەرەو بۆری مەیلەو سپی هەلّدەگەڕێ. زگیشی ڕەنگ دەبێ. زستانان نیشانەکانی سەری و زگی بەرچاو نییە. لە دەشتی خیزەلاّن و بەیاری کەنار زەویوزاران دەبینرێ. (123)

زیقاوه-ی کلک سپی (169)

خروس کولی دم سفید
Vanellus Leucurus
Vanneau á queue blanche
White-tailed Plover

۲۶،۵ سانتیمێتره. پشتی سوورخونه. نێوچاوان و کلکی سپییه. شابالّی بۆره. گەرووی سپییه و ملی قاوەیی کەم ڕەنگە. سینگی بۆره و بەرزگی سپی ئامالّ زەرد.



لاقی درێژ و زەرده. لە شیرناو، زۆنگ و قەراغ دەریاچەکان دەبینرێ. لەناو گیاوگۆلّی کورت لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (148)

## تۆرەمەی سوورِه (21F)
Family EMBERIZIDAE

بالّندەی دانەخۆرن. بەقەرا چۆلەکە دەبن. دندووکیان کورته. زیاتر لەجێگای ئاوەلاّ دەژین. پەڕ و بالّی نێره لە مێیه جوانتره. هەندێک لەوانە کاتی هێلکه و جووجکە بەتێکڕایی دەژین. زۆربە دوور لە ئاواییبانن. نێر و مێیەیان وێک ناچن. لەسەر دار، پنچک، زەوی و کونانددا هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: زەردەزێڕه، سوورِەمێرگه، سوورِەی ڕێ ڕێ، سوورِەی زەلان، سوورِەی سەر بۆر، سوورِەی سەر زەیتوونی، سوورِەی سەر شێ، سوورِەی کێوی، سوورِەی لاجانگ سپی، سوورِەی لاجانگ زەرد، سوورِەی لیمۆیی.

زەردەزێڕه (170)

زەردەپره سر سیاه
Emberiza melanocephala
Bruant mélanocéphale
Black-headed Bunting

* زەردەجـــــــوڕه، زەردەزوڕه، زەردەوەره، زەردەوەلی، زەردی زڕه، زەردی وەری، زەردی وەلی.

۱٦ سانتیمێتره. نێره بەرزگی تەواو زەرده، سەری ڕەشە و تۆقی ملی زەرده. پشتی شێ ڕەنگە. کلکی تووکی سپی تێدا نییه. پایزان سەری قاوەیی هەلّدەگەڕێ. مێیه پشتی قاوەیی زەیتوونی ڕێ ڕێیه و بەرزگی خەت و خالّی نییه. تووکی ژێر پاشەلّی زەرده. لەنێو پنچکان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبینرێ. (339)

سوورِه مێرگه (171)

زردەپره مزرعه
Emberiza calandra
Bruant proyer
Corn Bunting

* سورسوورِه مێرگه

۱۷،۵ سانتیمێتره. لە هەموو سوورِەکان گەورەتره. پەڕ و بالّی قاوەیی ڕێ ڕێیه. تووکی سپی لە کلک و بالّیدا نابینرێ. بەهۆی گەورەیی لەش و سەری گەوره و خڕ و

دندووکی ئەستوور لە چوڕە و باریکە جویّ دەکرێتەوە. نێر و مێیەی یەک ڕەنگە. لاق و دندووکی زەردە. کاتی فڕین قاچی شۆڕ دەبنەوە. لە زەویوزار، کەنار ڕێگایان، زەوی بەیار و سەر پەرژینان دەژی. لەناو گیای بڵیند، نێو پنچکی دڕکاوی و ژێر پەرژینان هێلانە ساز دەکا. (339)

سوورِە–ی ڕێ ڕێ (172)

زردەپرە راهراه
Emberiza striolata
Bruant striolé
Striped Bunting

١٣ سانتیمێترە. پشتی شێ ڕەنگە و ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە. بەرزگی تەواو خورماییيە کلکی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە و دەوری کلکی خورماییيە. نێرە سەری بۆرە و خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە و برۆی سپییە، مێیە قاوەییيە و خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی هەیە. لە نشێوی بەردەڵانی کێوان، بەیارە بەردەڵانێ کە گیای کەم لێ بڕوێ دەژی. هەروەها لە کاول و گوندانیش دەبینرێ. لەنێو بەردان هێلانە ساز دەکا. (340)

سوورِە–ی زەلان (173)

زردەپرە تالابی
Emberiza schoeniclus
Bruant des roseaux
Reed Bunting

١٥ سانتیمێترە. نێرە سەر و ملی ڕەشە و تۆقی سپی هەیە. (ئەمە زستانان دەبیتە قاوەیی پنۆک پنۆک) پشتی قاوەیی توندە و خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە و پاشەڵی بۆرە. شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. بەرزگی سپی ئامال بۆرە و تەنیشتی ڕێ ڕێیە. مێیە سەری قاوەییيە و مژۆڵی زەردی کاڵە. پاشەڵی سوورخونە. مل و بەرزگی زەردی کاڵە. خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی بەسینگ و تەنیشتیدا هاتووە. لە زەل و قامیشەڵانان دەژی. زستانان لە زەویوزاران دەبینرێ. لەنێو گیاوگۆڵی پڕ لە نزیک عەرز هێلانە دەکا. (338)



سوورِە–ی سەر بۆر (174)

زردەپرە سر خاکستری
Emberiza buchanani
Bruant á cou gris
Grey-necked Bunting

١٧,٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. سەر مل و لاسینگی بۆرە. چەنە و مل و خەتی ملی سپییە و خەتی خەنەیی تێدایە. بەرزگی خەنەییيە و خەتی ڕێ ڕێی توندی هەیە. دەوری چاوی سپییە. پشتی قاوەیی ئامال بۆرە و خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە. کلکی خەنەیی و شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. کردەوەی وەک سوورِەی سەر زەیتوونییە. لەشێوی بەردەڵانی کێوان و ڕەوەز و دوندی کەم گیا دەژی. لەسەر عەرز لەنێو پنچکی کورتی ناو ڕەوەزان هێلانە ساز دەکا. (340)

سوورِە–ی سەر زەیتوونی (175)

زەردەپرە سر زیتونی
Emberiza hortulana
Bruant ortolan
Ortolan Bunting

١٦ سانتیمێترە. بەرزگی ئامال چێرەییيە و ملی زەردە. سەر و سینگی کەسکی زەیتوونی کاڵە. خەتی ملی زەیتوونییە. لە نزیکەوە خەتی زەردی باریکی دەوری چاوی دەبینرێ. دندووکی چێرەییيە. پشتی قاوەیی ڕێ ڕێی ڕەشە. مێیە کاڵترە و کەسکایی سەری زۆر نییە و خەتی وردی ڕەشی لە سینگیدا هەیە. بەباڕی قاوەییترە. بەرزگی ڕێ ڕێیە. لە کوێستانان، شوێنی نزم، باغ و نێو پنچکان دەژی. لەسەر عەرز یان نزیک عەرز لەناو گیاوگۆڵ هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (339)

سوورِە–ی سەر شێ (176)

زردەپرە سر سرخ
Emberiza bruniceps
Bruant á tête rousse
Red-headed Bunting

١٦ سانتیمێترە. نێرە سەر و سینگی شێ ڕەنگە. بەرزگ و دامێنی زەردە. مێیە وەک مێیەی زەردەزێڕە دەچێ، بەڵام پشتی شینایی هەیە و ژێر پاشەڵی سپییە. لە شوێنی ئاوەڵا و ناو پنچکان، زەویوزاری پەرژیندار و نزیک ئاو دەژی. لە خوارەوەی پنچکان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (340)

سوورە-ی کێوی (177)

زردەپرە کوهی
Emberiza cia
Bruant fou
Rock Bunting

١٦ سانتیمێترە. سەر و ملی بۆرە. خەتی ڕەشی بەسەریدا کشاوە و دەوری چاوی داوە. کاتی چینەکردن کلکی فش دەکا و سپیایی کلکی دەردەکەوێ. پشتی شێ ڕەنگە و خەتی ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە. پاشەڵی شێیە و ڕێ ڕێی نییە. بەرزگی شێی ئاماڵ زەردە. پەڕ و باڵی مێیە توندتر و قاوەییترە. خەتی ڕێ ڕێی لە سینگ و تەنیشتدا هەیە. لە قەراغ کێوان، سەر دار و نزیک دەریا دەژی. لەسەر عەرز یان نزیک بەعەرز هێلانە دەکا. (339)

سوورە-ی لاجانگ سپی (178)

زردەپرە گونە سفید
Emberiza leucocephala
Bruant á calotte blanche
Pine Bunting

١٧ سانتیمێترە. نێرە سەری سپی و قاوەییە. مێیە خەتی پانی قاوەیی کاڵی پێدا کشاوە. سەری سپییە. بەباڕی قاوەییە و تووکی شێ ڕەنگ لە باڵیدا هەیە. نێرە و مێیە پاشەڵیان شێیە. کاتی هێلکە و جووجکە بەتەنیا دەژین. لەناو پنچک و لێڕەواری تەنک و زەویوزار و باغان دەژی. (340)

سوورەی-ی لاجانگ زەرد (179)

زەردەپرە رخ زرد
Emberiza cineracea
Bruant cendré
Cinereous Bunting

١٦ سانتیمێترە. باڵندەیەکی بۆرە، سەری زەردی تاریکە و ملی زەردی گەش. پاش مل و سینگی زەردە و بەرزگی سپی. پشتی بۆری ئاماڵ قاوەیی ڕێ ڕێیە. دندووکی ئاماڵ شینە و لاقی گۆشتێ و قاوەیین. مێیە بۆری تاریکە، سەری قاوەییترە، ملی زەردی ڕێ ڕێیە. بەباڕی پەڕ و باڵی پڕ ڕەنگترە. بەرزگی قاوەیی ئاماڵ بۆری ڕێ ڕێیە. بەڵام زەردایی لە ملدا هەیە. لە داوێنی بەردەڵانی کێوان کە تاک و تەرا دار و گیاوگۆڵی لێ شین بووە دەژی. (340)



سوورە-ی لیمۆیی (180)

زردەپرە لیمویی
Emberiza citrinella
Bruant jaune
Yellowhammer

١٦ سانتیمێترە. نێرە سەر و بەرزگی زەردی لیمۆییە. دامێن و پشتی بەڕەنگی شێیە. پشت و تەنیشتی ڕێ ڕێیە. کاتی فڕین شاپەڕی سپی کەنار کلکی دیار دەکەوێ. زەردایی پەڕ و باڵ لە مێیە و باڕی ئەو باڵندەیەدا کەمترە و خەتی ڕێ ڕێی زیاترە؛ بەتایبەت لە سەریاندا. لە زەوی و زاران، کەنار ڕێگایان، شوێنی ئاوەڵای گوندان دەژی. لەژێر پەرژین و کەنار کەندالآن هێلانە ساز دەکا. (339)

## تۆرەمەی سوورەقورینگ (22F)

Family PHOENICOPTERIDAE

* سوورەقوڵنگ، قازی سوور (؟)، کەرنگ (؟)

لەم تۆرەمەیە تەنیا یەک جۆری بینراوە. لە گۆلی ورمێ زۆرە. بەرۆژ لە ئاوی سوێردا دەبێ و شەوانە بۆ لەوەڕ دێتە ئاوی شیرین. لە دەستەی چەند هەزاریدا لە دەوری یەک کۆدەبنەوە. لە کاتی فڕیندا بەرێچکە دەکەونە دوای یەک. ڕەوی سوورەقورینگ لە دوورەوە سوور دەنوێنێ.

سوورەقورینگ (181)

فلامینگو
Phoenicopterus ruber
Flamant rose
Greater Flamingo

١٥٠ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. لاقی زۆر درێژە، تووکی سپییە و ژێرباڵی سوورە، دندووکی قەڵانگییە. بەهێمنی هەنگاو دەنێ، سەر لە ئاو ڕۆدەکا و دەلەوەڕێ. بەگەل دەگەڕێن. لە ڕووتەنی قەراغ ئاوی سوێر قوڕ لەسەر یەک کۆدەکاتەوە و دەیکا بەهێلانە و تاقە هێلکەیەکی تێدەکا. شوێنی ئاوگر. زەل، گۆل و گۆلاو جێ لەوەڕگەی ئەم باڵندەیە. (50)

## تۆرەمەی سەعوە (23F)
Family PRUNELLIDAE

ئەو باڵندانە وەک چۆلەکە بچووکن. دندووکیان باریک و نووک تیژە. زیاتر لەسەر عەرز چینە دەکەن و ڕێ ڕۆیشتنی تایبەتی خۆیان هەیە. کلک و باڵیان دەجووڵێننەوە. توند دەفڕن؛ بەڵام بەمەودای کەم. کەم خۆ وەدیار دەخەن. نێرە و مێیەیان وێک دەچێ. لەسەر پنچک و ناو بەردان هێلانە ساز دەکەن و جڕ و جانەوەر و کرم دەخۆن، بریتین لە: سەعوەی برۆ سپی، سەعوەی کێوی، سەعوەی مل ڕەش، سەعوەی لێڕەواران.

سەعوەی برۆ سپی (182)
صعوه ابرو سفید
Prunella ocularis
Accenteur de Radde
Radde’s Accentor

١٤.٥ سانتیمێترە. قاوەییە و هێڵی قاوەیی توندی بەسەر پشت و تەنیشتیدا کشاوە. ئەستوورایی دندووک و وردە تووکی پەنا گوێی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. چەنە و برۆی سپییە. گەروو و تەختایی سینگی زەردی ئاماڵ سوورەتییە. کلکی ئاماڵ بۆرە. لەنێو گیا و بەرداندا هێلانە دەکا. هەمی لەنێو باغ و زەویوزاران دەژی و هەمی لە داوێنی کێوان. (242)

سەعوەی کێوی (183)
صعوه کوهی
Prunella collaris
Accenteur alpin
Alpine Accentor

١٨ سانتیمێترە. ڕەنگی لە سەعوەی لێڕەواران کاڵترە. چەنە و ملی ئاماڵ سپییە و خاڵی ڕەشی تێدایە. سینگی بۆرە و خەتی پانی ئاماڵ قاوەیی بەتەنیشتیدا کشاوە. دوو خەتی سپی نارێکی لە باڵیدا هەیە. سەری کلکی ئاماڵ زەردە. پشتی قاوەیی ڕێ ڕێی ئاماڵ بۆرە. لاقی سووری مەرجانییە. بەبارِی بۆری بێ خاڵە. لە داوێنی بەرزی کێوان دەژی. لە کونی بەرد و نێو گیا و گۆڵان هێلانە ساز دەکا. (242)



سەعوەی مل ڕەش(184)
صعوه گلو سیاه
Prunella atrogularis
Accenteur á gorge noire
Black-throated Accentor

١٤ سانتیمێترە. وەک سەعوەی برۆ سپی دەچێ. سەر و لاجانگ و ملی ڕەشە. سینگی زەرد و زگی ئاماڵ سپییە. پایز و زستان تووکی سەر و ملی قاوەیی هەڵدەگەڕێ. زستانان لە دۆڵ و دەراندا دەژی؛ کەم خۆی لە شوێنی ئیشک و دەشتان دەدا. (242)

سەعوەی لێڕەواران (185)
صعوه جنگلی
Prunella modularis
Accenteur mouchet
Dunnock

١٤.٥ سانتیمێترە. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە و دێغ دێغی ڕەشی تێدایە. سەر و ملی بۆری قورقوشمییە. سەر و لاجانگی ئاماڵ قاوەیییە. بەرزگی بۆرە. دندووکی باریک و ئاماڵ ڕەشە. لەسەر عەرد چینە دەکا. زیاتر خۆ لە نێو گیا و گۆڵاندا دەشارێتەوە. بەنەرمی دەڕوا و هەر دەڵێی لاقی لە دووی خۆی دەکێشێ. دایم باڵان لێک دەدا. تەنیا دەژی. لەنێو پەرژین و پنچکاندا هێلانە ساز دەکا. (242)

## تۆرەمەی سەیرە (24F)
Family FRINGILLIDAE

دانەخۆرن. دندووکیان کورت و خڕ و قەوییە. پەڕ و باڵیان ڕەنگاوڕەنگە. بێجگە لەکاتی هێلکە و جووجکە زیاتر پێکەوە دەژین. نێرە و مێیەیان زیاتر یەک ڕەنگ نین. لەسەر دار و نێو پنچکان هێلانە ساز دەکەن. جارجار زیندەواری وردەڵە دەخۆن. بریتین لە: زەنگوڵە میرە، سەیرەی باڵ سوور، سەیرەی بۆر، سەیرەی پاشەڵ سپی، سەیرەی چێرەیی، سەیرەی دندووک خاچی، سەیرەی دندووک گەورە، سەیرەی ڕەش، سەیرەی زەرد، سەیرەی سوور، سەیرەی سەر ڕەش، سەیرەی سینگ سوور، سەیرەی کەسک، سەیرەی کێوی، سەیرەی مەغوولی، سەیرەی نێوچاوان سوور، سەیرەی لێڕەواران.

زەنگوڵەمیرە (186)

سهره معمولی
Carduelis carduelis
Chardonneret élégant
Goldfinch

* سەیرە

١٢ سانتیمێترە. نێر و مێیەی یەک ڕەنگە. باڵی زەرد و ڕەشە. کلکی ڕەش و سپییە. دەم و چاوی سوورە. پشتی قاوەیی بۆرە و بۆ لای پاشەڵی سپی هەڵدەگەڕێ. بەباڕی پشتی زەردی بۆڕیلەیە. پەڕ و باڵی پڕ لە خەت و خاڵی سوورگوێزییە. بەگەل لەباغ و زەویوزاران دەژی. پایز و زستانان لەبەیار و کەنار ڕێگایان دەبینرێ کە لە دانەوێڵەی پنچکی دڕکاوی خەریکی چینە کردنە. هێلانەی خۆی لەسەر چڵووکی دار و پنچکان ساز دەکا. (328)

سەیرە–ی باڵ سوور (187)

سهره بال سرخ
Rhodopechys sanguinea
Bouvreuil á ailes roses
Crimson-winged Finch

١٥ سانتیمێترە. لە کێوی بەرز دەبینرێ. نێرە پشتی قاوەیی توندە و بەرزگی زەردی کاڵە. سەری ڕەشە و لاجانگی چێرەیییە. لاسینگی خاڵی خورمایی تێدایە.باڵی ڕەش و چێرەیی گەشە. کلکی ڕەشە و دەوری کلکی سپییە. مێیە ڕەنگی تاریکترە. ڕەنگی چێرەیی پەڕ و باڵی کەمترە. سەری خاڵخاڵە (نەک ڕێ ڕێ) وەرزی هێلکە و جووچکە نەبێ هەر بەگەل دەژی. لەبەردەڵانی دوندی کێوان کە گیاوگۆڵی کەم بی دەژی. زستانان دەچێتە دۆڵ و دەران. لەنێو پنچکی نێو ڕەوەزان یان لە کونی بەرداندا هێلانە دەکا. (337)

سەیرە–ی بۆر (188)

سهره خاکی
Rhodopechys obsoleta
Bouvreuil de Lichtenstein
Desert Finch

١٤ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی تەواو قاوەیی بۆری کاڵە و لە بەرزگیدا کەم ڕەنگتر دەبێ. دندووکی خڕ و ئەستوور و ڕەشە. نێرە خاڵێکی ڕەشی لە دندووکی هەیە. شاپەڕی باڵی



ڕەشە و دەوری سپییە و خاڵێکی گەورەی چێرەیی لەسەر باڵی هەیە. کلکی دوو لک و ڕەشە و لای دەرەوەی سپییە. مێیە لە چاو نێرە کاڵترە. زوو دەستەمۆ دەبێ. لە زەویوزار و کێوپارەی کەم دار و دەوەن دەژی. لەسەر دار و پنچکان هێلانە ساز دەکا. (337).

سەیرە–ی پاشەڵ سپی (189)

سهره دمگاه سفید
Pyrrhula pyrrhula
Bouvreuil pivoine
Bullfinch

١٤٫٥ سانتیمێترە. نێرە بەرزگی سووری کاڵە. دامێنی سپییە. پشتی شین باوەی تولْخە. چەنە و نێوچاوان و سەری ڕەشە. دندووکی ئەستوور و خڕە. خەتی سپی بەدرێژایی باڵیدا کشاوە. کلکی ڕەشە. مێیە وەک نێرە دەچێ، بەڵام بەرزگی قاوەیی مەیلەو چێرەیییە و پشتی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. زیاتر خۆ نەدیو ڕادەگری. لە زەویوزاران، مێشەڵانان، باغی میوە و نێو پەرژینان دەژی. لەسەر دار و نێو پەرژینان هێلانە ساز دەکا. (337)

سەیرە–ی چێرەیی(190)

سهره صورتی
Rhodopechys githaginea
Bouvreuil githagine
Trumpeter Bullfinch

١٢٫٥ سانتیمێترە. دندووکی خڕ و ئەستوورە. لەسەر عەرز چینە دەکا. نێرە قاوەیی ئامالْ بۆرە و ئاتەگی سووری کالْە. بالْ و بەرزگ و دەم و چاویشی کالْە. بەهاران دندووکی سوور هەڵدەگەڕێ. هەم نێرە و هەم مێیە زستانان بۆرترن و دندووکیان مەیلەو زەردە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. زیاتر خۆ کووڕ دەکات و بەسەر عەرزدا بەجۆرێ دەڕوا کە نەبینرێ. لە بیابان و تەپۆڵکەی بەیاری نزیک ئاودا دەژی. لە کونی بەرداندا هێلانە ساز دەکا. (337)

سەیرە–ی دندووک خاچی (191)

سهره نوک قیچی
Loxia curvirostra
Bec-croisé des sapins
Crossbill

١٦ سانتیمێترە. دندووکی خاچییە، کلکی دوو لکە و کردەوەی وەک تووتی دەچێ. پەڕ و باڵی نێرە سوورە و پاشەڵی کاڵە. باڵ و کلکی بۆری توندە. نێرە بەباڕی قاوەیی ئاماڵ نارنجییە. مێیە زەیتوونییە و پاشەڵ و بەرزگی زەردە. بەباڕی بۆری مەیلەو سەوزە و بەرزگی ڕێ ڕێیە. باڵندەیەکە زوو دەستەمۆ دەبێ و بەگەل دەژی. لە فڕیندا سەری گەورە و کلکی کورتی سەرنج ڕاکێشە. لە ئەو لێڕەوارانەی کە داری وەک سەوڵ و کاژی لێ دەڕوێ دەژی. (337)

سەیرە–ی دندووک گەورە (192)

سهرەء نوک بزرگ
Coccothraustes coccothraustes
Gros-bec casse noyaux
Hawfinch

١٨ سانتیمێترە. مل و دندووکی ئەستوورە. کلکی کورتە و سەری کلکی سپییە. باڵی ڕەشی مەیلەو شینە و خەتێکی پانی سپی پێداهاتووە. سەری قاوەیی خاکییە و پشتی قاوەیی توند، بەرزگی قاوەیی کاڵە و بن دندووکی ڕەشە. دندووکی بەهاران شین هەڵدەگەڕێ و زستانان کاڵتر دەبێ. مێیە بەگشتی کاڵترە. بەباڕی قاوەیی ڕێ ڕێیە و خاڵی ژێر چەنەی زەرد ڕەنگە، بەرز دەفڕێ و زوو زوو شوێن دەگۆڕێ. لەکاتی فڕیندا بەسەری گەورە و کلکی قوڵە دەناسرێتەوە. لەسەر عەرز قیت دەڕوا و ڕۆینی وەک مراوییە. باڵندەیەکی زۆر سڵە. زستانان بەگەل دەبینرێ. لەسەر دار دەژی. زیاتر لەسەر چڵووکی داران وێکڕا هێلانە ساز دەکەن. (328)

سەیرە–ی ڕەش (193)

سهرەء سیاه
Mycerobas carnipes
Gros-bec á ailes blanches
White-winged Grosbeak

٢١ سانتیمێترە. دندووکی خڕ و زۆر گەورەیە. پەڕ و باڵی تەواو قاوەیی ئاماڵ ڕەشە؛ داوێن و ژێر ئاتەگی زەردە و سەری شاباڵی سپییە. مێیە کەمێک لە نێرە کاڵتر و



قاوەییترە. ئەو باڵندەیە لەسەر دار دەژی. لەسەر سەوڵی کێوی هێلانە ساز دەکا. (337)

سەیرە–ی زەرد (194)

سهرەء زرد
Carduelis spinus
Tarin des aulnes
Siskin

١٢ سانتیمێترە. نێرە سەوزی ئاماڵ زەردە و بەرزگی کاڵترە و سەر و چەنەی ڕەشە. پاشەڵ، خەتی باڵ، ئەولاو ئەولای کلکی قەیتانی پشت چاوی زەردە. پشت و تەنیشتی خەت خەتی قاوەییە. مێیە بۆرترە، تووکی زەردی کەمترە و ڕەشایی لەسەریدا نییە. بەرزگی سپی ڕێ ڕێیە. لەناو بێشە و پەرژینی بەرز و پڕ دەژی. لەسەر چڵووکی داران هێلانە دەکا. (328)

سەیرە–ی سوور (195)

سهرەء گلی
Carpodacus erythrinus
Roselin cramoisi
Scarlet Rosefinch

١٤٫٥ سانتیمێترە. نێرە، سەر و سینگ و شاقەڵی سوورە، دندووکی ئەستوورە. باڵی قاوەیی پڕ ڕەنگە و دوو خەتی باڵی هەیە. بەرزگی سپییە. نێرە و مێیە و باڕی ئەو باڵندەیە بەیەک ساڵەیی پشتیان قاوەیی مەیلەو زەردە، شاقەلیان کاڵترە و سەریان بۆرتر. بەرزگیان بەڕەنگی سباتە و ڕێ ڕێی باریکی قاوەیی تێدایە. ئەو باڵندەیە چاوی ڕەش و زەقە. سەری گەورە و خڕە. دوو خەتی کاڵ بەباڵیدا کشاوە و کلکی دوو لکە. لە مێشەڵان، ناو پنچکان و سەر داری کورتی نزیک ئاو دەژی. هێلانەی خۆی لە قەدی گیای ناو زۆنگ و زەڵان ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبینرێ. (338)

سەیرە–ی سەر ڕەش (196)

سهرەء سر سیاه
Fringilla montifringilla
Pinson du Nord
Brambling

١٤٫٥ سانتیمێترە. نێرە سینگ و شانی نارنجییە. بەهاران سەر و پاش ملی ڕەشە و

زستانان قاوەیی. باڵ و تەشک و داوێنی لەسەیرەی لێڕەواران سپیترە. مێیە زۆر وەک سەیرەی لێڕەواران دەچێ، بەڵام پەڕ و باڵی زەردایی کەمترە؛ هەروەها شاقەلی سپی و دێغ دێغی سەری لەو باڵندەیەی جوێ دەکاتەوە. زستانان لە لێڕەوار و زەویوزاران بەپۆل دەژی. (327)

سەیرە–ی سینگ سوور (197)

سهره ء سینه سرخ
Acanthis cannabina
Linotte mélodeuse
Linnet

١٣ سانتیمێترە. نێرە نێوچاوانی قاوەیی توندە. سەری بۆرە، باڵی قاوەییە و دەوری سپییە و کلکی دوو لکە. بەرزگی ئاماڵ زەردە و خەتی وردی قاوەیی و ڕەشی هەیە. سینگی چێرەییە. کاتی هێلکە و جووچکە سەر و سینگی سوور هەڵدەگەڕێ و ملی سپییە و خەتی قاوەیی تێدایە. مێیە سوورایی نییە؛ زۆرتر ڕێ ڕێیە. زستانان بەچەنە و ملی ڕێ ڕێ. سپی بوونی دەوری کلک و دندووکی ڕەشی لەسەیرەی کێوی جوێ دەکرێتەوە. لە زەویوزاری بەرفرەوان دەژی و لەسەر پەرژینان هێلانە ساز دەکا. (338)

سەیرە–ی کەسک (198)

سهره ء سبز
Carduelis chloris
Verdier d’Europe
Greenfinch

١٤.٥ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی کەسکی زەیتوونییە. شاقەلی کەسکی ئاماڵ زەردە و خاڵی زەردی لەسەر شاباڵ و دەوری کلکی هەیە. دندووکی ئەستوور و سپییە. لاقی چێرەیی کاڵە. مێیە بۆرترە و زەردی پەڕ و باڵی کەمترە. بەباری قاوەییترە و پشتی ڕێ ڕێیە. لە باغ و ناو پنچک و زەویوزاران دەژی. لەنێو پەرژین و پنچکان هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر دەبینرێ. (328)

سەیرە–ی کێوی (199)

سهره ء کوهی
Acanthis flavirostris
Linotte á bec jaune
Twite

١٣ سانتیمێترە. لە ئاست وێنە و کردەوە وەک سەیرەی سینگ سوور دەچێ. پشتی



زەردی بۆرە و قەیتانی ڕەش و قاوەیی تێدایە. بەرزگی کاڵە. ملی ئاماڵ زەردی پڕ ڕەنگی ڕێ ڕێیە. نێرە ئاتەگی ئاماڵ چێرەییە و لە مێیەدا دەبێتە زەردی ڕێ ڕێی ڕەش. دندووکی هاوینان زەردی ئاماڵ بۆرە و زستانان زەردی ڕوون. لە مێیە و باری سەیرەی سینگ سوور بەهۆی کەمی سپیایی سەر باڵ و کلک، پشتی پڕ ڕەنگترە، ملی زەردی ئاماڵ نارنجی و کلکی درێژتر (دندووکی زەرد لە زستاندا) جوێ دەکرێتەوە. لە داوێنی کێو و بەیاری بڵێند دەژی. (338)

سەیرە–ی مەغوولی (200)

سهره ء مغولی
Rhodopechys mongolica
Bouvreuil de Mongolie
Mongolian Trumpeter Finch

١٣ سانتیمێترە. وەک مێیە سەیرەی چێرەیی دەچێ. پشتی قاوەییترە و دندووکی ئەستوور نییە و لەجیاتی ئەوەی سووری نارنجی بێ. قاوەیی ئاماڵ زەردە. نێرە بڕۆی چێرەییە و بەرزگی زەردی مەیلەو سباتە. باڵی قاوەیی و سەری شاپەڕی چێرەیی و سپییە. کلکی قاوەییە و دەوری شاپەڕی سپییە. مێیە وەک نێرە دەچێ، بەڵام پەڕ و باڵی ڕەنگی چێرەیی کەمترە. لە تەپۆلکی ڕووت و ئیشک و نشێوی بەردەڵانی کێوان دەژی. (337)

سەیرە–ی نێوچاوان سوور (201)

سهره ء پیشانی سرخ
Serinus pusillus
Serin á front d’or
Gold-fronted Serin

١٢ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. دندووکی ئەستوورە. سەری ڕەشە و نێوچاوانی سوورە. ئاتەگی نارنجییە و کلکی دوو لکە. پشتی قاوەیی زەیتوونییە و دێغی ڕەشی تێدایە. بەباری کاڵترە و سوورایی نێوچاوانی نییە. لە لێڕەوار و دۆڵ و دەرەی کەم گیا و نشێوی کێوان دەژی. زستانان دێتە ناو زەویوزار و داران. لەسەر داری سەوڵی کێوی هێلانە ساز دەکا. (337)

سەیرە-ی لێرواران (202)

سهره ء جنگلی
Fringilla coelebs
Pinson des arbres
Chaffinch

١٥ سانتیمێترە. باڵی دوو هێڵی سپی تێدایە. لە فڕیندا شاپەڕی سپی دەوری کلکی وە دیار دەکەوێ. نێرە بەرزگی قاوەیی ئاماڵ چێرەییە. سەر و پاش ملی بۆریلەیە. ئاتەگی ئاماڵ سەوزە. مێیە پشتی قاوەیی مەیلەو زەیتوونی کاڵە؛ بەرزگی ڕوونترە. نێرە و مێیە زیاتر لەدەستەی جوێ جوێدا هەڵدەفڕن. لەناو پەرژین، لێرەوار، باغ و زەوی دەورە ئاوەڵا دەژی. لەناو پنچک و سەر دار هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆرە. (327)

**تۆرەمەی سێروو** (25F)
Family STURNIDAE

ئەو باڵندانە بەگەل دەژین، پڕ قاژ و قووڕن. کلکیان قوڵەیە، دندووکیان درێژ و نووک تیژە، توند دەفڕن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە کوندا هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: خەزایی، سێروو، مینا.

خەزایی (203)

سار صورتی
Sturnus roseus
Martin roselin
Rose- coloured Starling

* ئاگرمەلووچ، ئاگرمەلووچک، ئاگرەمەلیچ، ئاگرەمەلیچک، ئایلەمەن، ئاینەمەل، ئاینەمەن. تش مەلیچ، خەزاڵی، ساربەڵەک، سارکی بەڵەک، سەمەدمەد (؟)، سێرووبەڵەکە، سیرووخەزاڵە، تووخورە (؟)، تووەخورە (؟) عایلەمەن، عایلەمەنە، عەینەمەل، کوللەخۆرە، کەشوشک (؟)، کەشوێلە (؟)

٢١ سانتیمێترە. وێنە و ئاکاری لەهی سێروو دەچێ، بەڵام لە فڕیندا فەرقی هەیە. پشت، پاشەڵ و بەرزگی ئاماڵ سپییە و سەر و باڵ و کلکی ڕەشی بریقەدارە، نەختێ کاکۆڵی هەیە. دندووکی ئاماڵ زەردە (هاوینان قاوەیی هەڵدەگەڕێ). لاقی سپی واشە. بەهاری قاوەیی بۆرە و پەڕ و باڵی پڕ ڕەنگترە و هەروەها کاکۆڵی نییە، بەگەل دەژی و تەنانەت کاتی هێلانە سازکردنیش هەر بەگەل دەبینرێن. زیاتر لە دەوروبەری مێگەل و



گاران خەریکی چینەکردن دەبێ. لە زەویوزار، ڕەوەزی بەرزی کێوان و هەروەها لە دەشتاندا دەبینرێ. لە کوندا هێلانە چێ دەکا. هاوینان زۆرە. (230)

سێروو (204)

سار
Sturnus vulgaris
Etourneau sansonnet
Starling

* ڕەش چێلەک (؟)، ڕەشولە، ڕەشۆڵە، ڕەشۆڵی، ڕەشێلک، ڕەشێلە، ڕەڤشێلە، ڕیشۆڵە، ڕیشۆڵی، سێ کەرک (؟)، گاوانی، مریچەڕەشە (؟)، مەلەڕەشە (؟)

٢١ سانتیمێترە. تەواوی پەڕ و باڵی ڕەشی بریقەدارە. دندووک و سەری باڵانی تیژە. زستانان پەڕ و باڵی خاڵخاڵ دەبی، بەتایبەت لە مێیەدا بەجوانی بەرچاوە. بەباری قاوەییە، گەرووی سپی واشە. دندووکی باڵندەی ڕەسیو زستانان ئاماڵ ڕەشە و بەهاران لیمۆیی. باڵندەیەکی بەقاژ و قووڕە. توند و ڕاست دەفڕێ. بەگەل چینە دەکا و وچان دەدا. پاییز و زستانان دەمەو ئێوارە لە دەستەی زۆردا لەسەر خانووبەرەی بڵیند، دارستان و قامیشەڵاناندا دەنیشن و جریوەیان وڵاتێ پڕ دەکا. لە کوندا هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (230)

مینا (205)

مینا
Acridotheres tristis
Martin triste
Common Mynah

٢٣ سانتیمێترە. سەری ڕەشە و نەختێ کاکۆڵی هەیە. مل و بەرسینگی بۆرە، پەڕ و باڵی قاوەیی شەڕابییە، پشتی پڕ ڕەنگتر و بەرزگی کاڵترە. شاقەڵی سپی واشە ئەستوورایی باڵی خاڵێکی سپی تێدایە. کلکی ڕەشە، سەری کلکی خڕە و دەوریشی سپییە. دندووک و چاو و دەوری چاوی زەردە. زیاتر بەجووت و جارجاریش لە دەستەی بچووکدا دەبینرێ. کردەوەی وەک سێروو دەچێ. لە میچی خانوو، کونی دار و دیواردا هێلانە دەکا. (231)

## تۆرەمەی شالوور (26F)
Family BURHINIDAE

* سەرکەشکە (؟) شاللور، شالوول

شالوور بەدەنگخۆشی مەنشوورن. زیاتر لە شوێنی ڕووتەن دەبن. لەم چەشنە باڵندانەن کە خۆ نەدیو دەکەن، هەتا مەترسی بەتەواوی هەڕەشەیان لێ نەکا نافڕن. بریتین لە: شالوور، شالووری گەورە.

شالوور (206)
چاخ لق
Burhinus oedicnemus
Oedicnême criard
Stone Curtew

٤٠ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. چاوی گەورە و زەردە. دندووکی ئەستوور و قوڵەیە. ئەستوورایی دندووکی زەردە و سەری دندووکیشی ڕەشە. لاقی ئەستوور و درێژ و ئاماڵ زەردە. دوو خەتی سپی بەدرێژایی باڵیدا ڕاکشاون. بەپێڕۆ توند دەڕوا. پێڕۆی بەدزە دزەیە. کاتێ هەست بەمەترسی بکا خۆ بەعەرزەوە مەڵاس دەکا. لە شۆرەکات، دەشت، بەیار و شوێنی نیوە ڕووتەن و جارجار لەناو زەویوزاردا دەبینرێ. هاوینان زۆر هەیە. لەسەر عەرزی ڕووت دوو هێلکان دەکا و لەکاتی مەترسیدا جێی هێلانەکەی دەگوێزێتەوە. (147-148)

شالوور–ی گەورە (207)
چاخ لق هندی
Esacus recurvirostris
Grand oedicnême
Great Stone Plover

٥٢ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. دندووکی ئەستوور و کەمێک قیتە. دەم و چاوی بەڵەکە. سەر کلکی بەڵەکە. لاقی درێژ و زەردی ئاماڵ کەسکە. شەوانە وە جم و جووڵ دەکەوێ. زیاتر بەجووت دەگەڕێن. لە بەستێنی چۆماوی گەورە و خیزکەڵێنی قەراغ گۆل و زەلان دەبینرێ. لە شوێنی خیزەڵان هێلکە دەکا. (148)



## تۆرەمەی شاوە (27F)
Family ARDEIDAE

* بزن لەر (؟)، بزەلەر (؟) شاف، شاهوکە، شاهۆ، شاهوو، ماسی هەڵچنە، وێرغال (؟)

ئەو باڵندانە لاق و ملیان درێژە و دندووکیان تیژە. باڵیان پانە و کلکیان تا ڕادەیەک قوڵەیە. هێندێکیان کاکۆڵ و یاڵ و بژیان هەیە. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. لەناو شام و گۆلاو و قەراغ چۆماندا دەبینرێن. شێوەگەلی جۆر بەجۆریان هەیە. هەندێک بەلۆقاوی درێژ لە تەنکاوان دەگەڕێن و بەچاوی بەحوکمیان شوێنی گیانلەبەرانی ورد و درشتی ناو ئاو دەگێڕن. لە ڕاوکردندا زۆر بەدەستوبردن، کەم وا هەیە نێچیر لە چنگ دندووکی درێژی ئەوان قوتاری بێ. هێندێکیان، وەک واق، لەسەر ئاودڕ و لەبن کەنداڵان مراقیب دەمێنن و جووڵە لە خۆ دەبڕن؛ هەر کە نێچیریان کەوتە بەر گاز لە چاو ترووکانێکدا پڕی پێدادەگرن و لووری دەدەن. لەناو قامیشەڵانی پڕ و سەر لکی گەز و دار و لاوێنی دەم چەم و لێو شەتاندا بەگەل هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: شاوەڕیخنە، شاوەزەردکە، شاوەسپیلکە، شاوەسپیلکەی بچووک، شاوەسوڵتانی، شاوەشینە، شاوە مل درێژ، واق، واقی بچووک، واقی شەوێ.

شاوەڕیخنە (208)
گاوچرانک
Bubulcus ibis
Héron garde-boeufs
Cattle Egret

* ڕیخنە خۆرە، شاوەبۆگەنیو

٥٠ سانتیمێترە. لە دوورەوە سپی دەنوێنێ. لاقی سوورە. چەند تووکی مەیلەو زەردی درێژ لە سینگی ڕواوە. زۆرجار لەناو دەستەوڵاغ و دەسلەوەڕاندا دەبینرێ. جاری وایە لەسەر پشتی کەڵ و گامێش و ڕەشەوڵاغان دەنیشێ و ئەو مێش و مەگەزانە ڕاو دەکا کە لەوان دەهاڵێن. ناوەکەی بەهۆی ئەم کارەوەیە. بەپێچەوانەی هاوڕەگەزەکانی کەمتر خۆ لە ئاو دەدا. بەگەل لەناو قامیشەڵان و داری کەنار ئاو هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (49)

شاوەزەردکە (209)

حواصیل زرد
Ardeola ralloides
Héron crabier
Squacco Heron

* شاوەجغەدار، شاوەزەردە

٤٥ سانتیمێترە. ڕەنگی قاوەیی مەیلەو زەردە. لەکاتی فڕیندا سپی دەنوێنێ. چەند پەڕی درێژ بەچەشنی کاکۆڵ بەپاش ملیدا هاتوونە خوار. دندووکی بەزستان سەوزە، سەری دندووکی ڕەشە، بەڵام لەکاتی کورک بووندا ڕەش و شینە. قاچی سەوزە. لەناو دار و قامیشدا دەژی. کەمتر دێتە شوێنی ڕووت. هاوینان زۆرە. لەسەر دار و یان قامیش هێلانە دەکا. (49)

شاوەسپیلکە (210)

اگرت بزرگ
Egretta alba
Grande Aigrette
Great White Heron

٨٨ سانتیمێترە. باڵندەیەکی یەکدەست سپییە، ملی زۆر درێژە. لاقی ڕەشی شین باوە. دندووکی زەردە و سەری دندووکی ڕەشە. تووکی سەر شانی درێژ دەبێ. لە قەراغ گۆل و چۆم و گۆلاوی کەم گیاوگۆڵ دەژی. زیاتر بەگەل لەناو قامیشەڵاندا هێلانە ساز دەکا. کەم وایە لەسەر دار هێلانە ساز بکا. زستانان زۆرە. (49)

شاوەسپیلکەی بچووک (211)

اگرت کوچک
Egretta garzetta
Aigrette garzette
Little Egret

٥٥ سانتیمێترە. تەواو سپییە، دندووکی درێژ و ڕەشە، لاقی ڕەش و پەنجەی زەردی لەکاتی فڕیندا بەجوانی دیارە. بەهارانە پەنجەکانی سوور هەڵدەگەڕێن. زۆرتر لە تەنکاو و شوێنی کەم گیاوگۆڵدا دەلەوەڕێ. بەهاوینان کاکۆڵ و پەڕی سەر شانی درێژ دەبن. لە شامدا وێڕای شاوە جۆر بەجۆرەکانی تر لەسەر داران هێلانە ساز دەکا. (49)



شاوەسوڵتانی (212)

حواصیل خاکستری
Ardea cinerea
Héron cendré
Grey Heron

* شاوەبەڵەک، شاوەعەسڵە

٩٠ سانتیمێترە. پشتی بۆرە و سەر و ملی سپییە. کاکۆڵی هەیە، دوو خەتی ڕەش بەدرێژایی ملیـــدا هاتوونە خـــوار و لەبەرزگی بوونەتە یەک. دندووکی درێژ و لاقی قاوەیین. بەهاران لاقی سوور هەڵدەگەڕێن. ئەو باڵندەیە لەناو ئاودا مڕاقیب دەمێنێ هەتا نێچیری خۆی ڕاو بکا. تاقەتی فڕینی زۆرە، جاری وایە لەسەر داران هەڵدەنیشێ. بەگەل لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر دەبێ. (32)

شاوەشینە (213)

اگرت ساحلی
Egretta gularis
Aigrette des récifs
Western Reef Heron

* خەم خورە، خەم خۆرە، خەمە خورە، خەمەخۆرە، واق واق کەرە

٥٥ سانتیمێترە. لە باری ڕەنگەوە دوو جۆرن؛ بۆری مەیلەو ڕەش و سپی. یەکەمیان پەڕ و باڵی ڕەشن، بەرلۆغە و گەرووی سپییە. ئەوی تریان تەواو سپییە. هەر دوو جوور دندووکیان زەردی مەیلەو سەوزە. لاقیان ڕەشە و پەنجەیان زەردە. ئەو باڵندەیە کەم هەیە. بەگەل لەناو گیاوگۆڵی شام هێلانە دەکا. (49)

شاوە مل درێژ (214)

حواصیل ارغوانی
Ardea purpurea
Héron pourpré
Purple Heron

٧٨ سانتیمێترە. پشت و باڵەکانی بۆری مەیلەو قاوەیین. کاکۆڵی ڕەش و ملی درێژە. پشتی بۆری توندە، سینگی خورماییە و بەرزگی ڕەشە. لەکاتی فڕیندا گنج و قەف دەخاتە ملی. زۆر کەم لەسەر داران دەبینرێ. هاوینان زۆر هەیە. لەناو شام و زەل و شوێنە ئاوگرە پڕ گیاوگۆڵەکاندا هێلانە ساز دەکا. (32)

واق (215)

بوتیمار
Botaurus stellaris
Butor étoilé
Bittern

* شاڤاشین، شاڤەشین، شیرین شاهۆ، شینەشاهۆ، مەلوو (؟)

٧٥ سانتیمێترە. ڕەنگی قاوەیی پڕ خەت و خاڵە. لاقی شین و گەورەیە. ئەگەر هەست بەمەترسی بکا سەر قوت دەکا و جووڵە لە خۆ دەبڕێ. هەڵدەفڕێ بەڵام بەچاکی نا، زۆربەی ژیانی تەنیایە و خۆ نەدیو دەکا. بەڕۆژ خۆ لەناو قامیشەڵان و گیاوگۆڵدا حەشار دەدا. بەیانان زوو یان تاوپەڕی ئێواران دەست دەکا بەگەڕان و ڕاو. هاوینان زۆر دەبێ. لەناو قامیشەڵانی گەورەی شام و گۆلاندا هێلانە ساز دەکا. ناوەکەی لە دەنگییەوە هاتووە. (32)

واق-ی بچووک (216)

بوتیمار کوچک
Ixobrychus minutus
Blongios nain
Little Bittern

٣٥ سانتیمێترە. لە شاوە هەرە چووکەکانە. پشتی ڕەش و بەرزگ و سەری باڵی مەیلەو زەردە. ڕەنگی پشتی نێرەیان ڕەشی مەیلەو سەوزە. مێیەیان پشتی ڕێ ڕێیە و هەروەها بەرزگی زەردی ڕێ ڕێیە. دندووکیان زەردە. کاتی کورک بوون سوور دەبێ، لاقیان سەوزە. نەوی فڕە. بەڕۆژ خۆ حەشار دەدا. بەیانان و تاوپەڕی ئێواران دەست دەکا بەڕاو. هاوینان زۆر دەبێ و لە گەوەڕی پڕ گیاوگۆڵی چەم و زەل و ئاوگران لەسەر دار و قامیش هێلانە ساز دەکا. (32)

واق-ی شەوێ (217)

حواصیل شب
Nycticorax nycticorax
Héron bihoreau
Night Heron

٦٠ سانتیمێترە. لاقی قوڵەیە، پشتی مەیلەو ڕەشە و بەرزگی سپییە. دوو سێ پەڕی درێژی لە پاش ملی ڕواوە. دندووکی ئەستوور و چاوی سوورن. لاقی زەردن. هەتا بێچوویە کاکۆڵی نییە. بەیانان زوو هەروەها تاوپەڕی ئێواران دەست دەکا بەڕاو، بەڕۆژ خۆ نەدیو دەکا. لە گەوەڕە پڕ گیاوگۆڵەکانی شام، چەم و شوێنە ئاوگرەکانی پڕ دار



دەژی. بەگەل لەناو قامیشەڵاندا هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبێ. (32)

## **تۆرەمەی شوان خڵەتێنە** (28F)
Family CAPRIMULGIDAE

* دەلدەلۆک (؟)، شڤان کوژ، شوان خاپین، شوان خلتنە، شوان هەڵخڵەتێنە.
گەوریلە (؟)

ئەو باڵندانە جڕ و جانەوەر خۆرن. بەشەو یان بوولێڵ دەکەونە جم و جووڵ. چاویان گەورەیە، زاریان زەلامە، لاق و دندووکیان کورتە، باڵیان درێژ و کلکیان گەورەیە. پەڕ و باڵیان لە ڕەنگی گیاوگۆڵی زەرد بووی شوێنی ژیانیان دەچێ. ئەم مەبەستە بووە بەهۆی ئەوەی بەهاسانی خۆ لە بەرچاوان نەدیو بکەن. بەڕۆژ جم و جوولێکی ئەوتۆیان نییە. بەبێ دەنگ دەفڕن. بەتەنیا دەژین. نێرە و مێیە یەک ڕەنگن. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: شوان خلەتێنە، شوان خڵەتێنەی بلووچی، شوان خڵەتێنەی میسری. شوان خڵەتێنەی هیندی.

شوان خڵەتێنە (218)

شبگرد معمولی
Caprimulgus europaeus
Engoulevent d’Europe
Nightjar

٢٦ سانتیمێترە. دەنگی تایبەت بەخۆی هەیە و شەوانە دەبیسرێ. بەدەنی قاوەیی مەیلەو بۆرە. ڕێ ڕێیە پڕە لە خەت و خاڵی قاوەیی. بەهۆی ئەم تایبەتییە لەگەڵ عەرز خۆ یەک ڕەنگ دەکا. سەری پانە، دندووکی چکۆڵەیە و زاری زل. باڵ و کلکی درێژە. نێرە سێ خاڵی سپی لە ئاخری کلکیدا هەیە و هەروەها سەری کلکیشی سپییە. بەڕۆژ بێ جووڵەکردن لەسەر دار یان عەرز خۆکورژ دەکا. لە ڕووتەن و دەوروبەری تەپۆڵکە خیزەڵانەکاندا دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلکە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. تاوپەڕی ئێواران و شەوانە مێش و مەگەز ڕاو دەکا. لەسەر عەرزی ڕووت هێلکە دەکا. (184)

شوان خڵەتێنە-ی بلووچی (219)

شبگرد بلوچی
Caprimulgus mahrattensis
Engoulevent de Sykes
Sykes’ Nightjar

٢٢ سانتیمێترە. نێرە خاڵی سپی لەسەر شاباڵی هەیە. شاپەڕی کلکی سپییە. مێیە

له نێره دەکا، بەڵام سپیایی سەر کلکی نییه و خاڵی سەر شاباڵی بچووکتر و کاڵتره. پەڕ و باڵی ئاماڵ قاوەییيه. شوێنی ژیانی وەک شوان خلّەتێنەیه، بەڵام جار جار له شۆرەکات و زەوی ئاودراویش دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانه ساز دەکا. (144)

شوان خلّەتێنه-ی میسری (220)
شبگرد دشتی
Caprimulgus aegyptius
Engoulevent d’Egypte
Egyptian Nightjar

**٢٥** سانتیمێتره. پەڕ و باڵی له شوان خلّەتێنه کاڵتر و خاکیتره. سەرەڕای ئەوەی خەت و خاڵی وردی هەیه بەڵام پەڕ و باڵی یەکدەست دەنوێنێ. نەنێره و نەمێیه خاڵی سپییان لەسەر باڵ و کلکدا نییه. تووکه وردی بن شاباڵی سپییه. له دەشت و خیزەڵانی بیاباندا دەبینرێ. (184)

شوان خلّەتێنه-ی هیندی (221)
شبگرد هندی
Caprimulgus asiaticus
Engoulevent de I’Inde
Indian Nightjar

**٢٤** سانتیمێتره. خاڵێکی گەورەی سپی لەسەر باڵی هەیه، بەڵام له مێیەدا ئەم خاڵه نییه. نێره پشتی بۆری ئاماڵ زەرده و خەتی ڕەشی بەسەر و پشتیدا هاتووه. پاش ملی ئاماڵ زەردی لێیه و سەری کلکی سپییه. هەردوو لاجانگی خاڵی سپی گەورەی تێدایه. له شوێنی ئیشکان دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانه ساز دەکا. (148)

## **تۆرەمەی شێلاقه** (29F)
Family SCOLOPACIDAE

* چلوور ( ؟ )، زوڕناژەنه، شێللاقه

باڵندەی تەنکاوانن، لاقیان تا ڕادەیەک درێژه. باڵیان درێژ و سەرپەڕ تیژه، هەروەها دندووکیشیان درێژه، جۆرێک دندووک ڕاستن و جۆرێک دندووک خوار. ڕەنگی پەڕ و باڵیان زیاتر هاوینان و زستانان دەگۆڕێ. زۆربەیان کۆچەرین. نێره و مێیەیان یەک ڕەنگه. لەسەر عەرز هێلانه ساز دەکەن. له گیا و گیانلەبەرانی ورد کەڵک وەردەگرن. بریتین له: ئەحمەد ڕاوکەر، ئەحمەد



ڕاوکەری باڵ سپی، ئەحمەد ڕاوکەری برۆ سپی، ئەحمەد ڕاوکەری خەنەیی، ئەحمەدڕاوکەری دندووک باریک، شێلاقەبۆره، شێلاقەشامی، شێلاقەشەنگه، شێلاقەعەسڵه، شێلاقەی بچووک، شێلاقەی بەرزگ ڕەش. شێلاقەی چلّپاوان، شێلاقەی خاڵخاڵ، شێلاقەی دندووک پان، شێلاقەی ندووک قیت، شێلاقەی ڕەش باو، شێلاقەی شێ ڕەنگ، شێلاقەی کلک سپی، شێلاقەی لاق سوور، شێلاقەی لاق کەسک، قوڕاویلکەی بچووک، قوڕاویلکەی تاق، قوڕاویلکەی گەوره، قوڕاویلکەی ناوینه، مرەلاره.

ئەحمەدڕاوکەر (222)
گیلانشاه بزرگ
Numenius arquata
Courlis cendré
Curlew

**٥٢** هەتا **٥٧** سانتیمێتره. دندووکی درێژه و بۆ خوارێ شۆڕ بۆتەوه. بەدەنگی دەناسرێتەوه. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ زەرده و پڕه لەخەت. داوێنی سپییه. له ئاوگر و قوڕ و چلّپاوی قەراغ شام و دەریاچەکاندا دەبینرێ. (145)

ئەحمەدڕاوکەر-ی باڵ سپی (223)
گیلانشاه بال سفید
Limosa limosa
Barge â queue noire
Black-tailed Godwit

٤٠ سانتیمێتره. دندووک و لاقی له ئەحمەدڕاوکەری خەنەیی درێژتره. درێژی لاقی بەجۆرێکه کاتی فڕین لەکلکی تێدەپەڕێ. خەتی سپی بەباڵیدا هاتووه، هەروەها کلکی سپییه و سەری کلکی ڕەشه. هاوینان سەر و سینگی شێ ڕەنگه، تەنیشت و زگی سپییه و خەتی ڕەشی پێداهاتوون. بەباڕی مل و سینگی زەردی خورماییيه. له ئاودڕ و زەل و داوێنی دەریاچه شیرنەکان دەژی. (145)

ئەحمەد ڕاوکەر-ی برۆ سپی (224 )
گیلانشاه ابرو سفید
Numenius phaeopus
Courlis Corlieu
Whimbrel

٤٠ سانتیمێتره. پشتی قاوەیی کەم ڕەنگی پنۆک پنۆکه. دندووکی خواره و لەهی

ئەحمەدڕاوکەری گەورە بچووکترە. سەری ڕێ ڕێیە. بڕۆی سپییە. لە ئاودڕ و قوڕ و چلپاوی قەراغ شام و دەریادا دەبینرێ. (145)

ئەحمەدڕاوکەر-ی خەنەیی (225)

**گیلانشاه حنایی**
Limosa lapponica
Barge rousse
Bar-tailed Godwit

**٣٧** سانتیمێترە. ئەم باڵندەیە وەک ئەحمەدڕاوکەری باڵ سپی دەچێ، بەڵام لەو بچووکترە. کلکی ڕێ ڕێی پترە. شاقەلی بۆرە. خەتی سپی سەر باڵی نییە، دندووکی خوارترە و لاقی قوڵەترە. نێرە هاوینان شێی سوورباوە؛ بەتایبەت سەر و مل و سینگی. مێیە ڕەنگی بۆرترە. زستانان هەردوو کاڵتر دەبن. بەباڕی سینگیان زەردی ڕێ ڕێیە. لە قەراغ ئاوان دەژین. (145)

ئەحمەدڕاوکەر-ی دندووک باریک (226)

**گیلانشاه خالدار**
Numenius tenuirostris
Courlis á bec grêle
Slender-billed Curlew

٤٠ سانتیمێترە. لەچاو ئەحمەدڕاوکەرەکانی تر کاڵە. پشتی پنۆک پنۆکە، بەرزگیشی هەر پنۆک پنۆکە، بەڵام کاڵترە. سەری ڕێ ڕێیە؛ ئەم خەتانە وردن. بەرزگ و ئاتەگی سپییە. لە گۆلاو و زەلاندا دەژی. (145)

شێلاقە بۆرە (227)

**تلیله سفید**
Calidris alba
Bécasseau sanderling
Sanderling

٢٠ سانتیمێترە. سپییە، بچووکە، قەڵەو و چوست و چالاکە. لەو شوێنانە دەلەوەڕێ کە شەپۆل لە قەراغان دەدا، سەری باڵ و کلکی ڕەشە. تووکی دەوری کلکی لەچاو بەدەنی کاڵترە. هاوینان سەر و سینگی شێ ڕەنگە و خاڵی ڕەشی تێدایە. زگی تەواو سپییە. بەباڕی پشتی بەڵەکە و سەر و سینگی زەردی ئاماڵ سپییە. لە قەراغ ئاوان دەبێ. (134)



شێلاقە شامی (228)

**آبچلیک تالابی**
Tringa stagnatilis
Chevalier stagnatile
Marsh Sandpiper

**٢٢** سانتیمێترە. دندووکی ڕاست و شووشە. نێوچاوانی سپییە. لاقی کەسکە و تا ڕادەیەک درێژ. هاوینان نێوەڕاستی پشتی ڕەشە و قەراغەکانی زەردباوە؛ بەم چەشنە ئەم باڵندەیە خاڵخاڵ دەبێ. لەکاتی فڕیندا بۆر دەچێ و قاچی لەکلکی درێژترە. زستانان لە گۆلاو و زۆنگاندا دەژی. (135)

شێلاقە شەنگە (229)

**آبچلیک شکیل**
Philomachus pugnax
Chevalier combattant
Ruff, Reeve

نێرە **٢٩** سانتیمێترە و مێیە **٢٣** سانتیمێترە. نێرە کاتی گەرم داهاتن و هێلکە کردنی مێیە؛ تووکی مەیلەو درێژی دەوری گەردنی هەڵدەدا. ئەم تووکانە تێکەڵاوێک لە ڕەنگەکانی ڕەش، سپی، بنەوش، شێ و زەرد. لەکاتی فڕینیشدا بەم تووکانەوە وەک ملی هەڵمسابێ وایە. نێرە و مێیە لە زستاندا بەڕەنگی پشتیان لێک جوێ دەکرێنەوە. مێیە سینگی زەردە و وەک نێرە تووکی ملی نییە هەڵیدا. لە گۆلاو و قەراغ دەریاچە و ئاودڕان دەژین. (135)

شێلاقە عەسڵە (230)

**آبچلیک آوازه خوان**
Tringa hypoleucos
Chevalier guignette
Common Sandpiper

**١٩** سانتیمێترە. پشتی قاوەیی ئاماڵ نییە. زگی سپییە، مل و بەرسینگی ڕێ ڕێیە. نەوی بەسەر ئاودا دەفڕێ. لەکاتی فڕیندا باڵی شۆڕە، باڵی خەتی سپی تێدایە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. زیاتر لەناو بەردەڵانی قەراغ چۆمەلاندا دێ و دەچێ. (136)

شێلاقه-ی بچووک (231)

تلیله کوچک

Calidris minuta

Bécasseau minute

Little Stint

١٤ سانتیمێتره. دندووکی ڕاست و قوڵەیه. هاوینان سەر و پشتی ڕەنگ خورماییه. سینگی ڕێ ڕێیه. زگ و برۆی سپییه. زستانان پشتی بۆره؛ مل و سینگی کاڵتره. لەکەنار دەریا و ئاودڕ و گۆلاندا دەژی. (134)

شێلاقه-ی بەرزگ ڕەش (232)

تلیله شکم سیاه

Calidris alpina

Bécasseau variable

Dunlin

١٧ سانتیمێتره. بەرزگی ڕەشه، پشت و سەری شێ ڕەنگه و ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایه، سینگی ئاماڵ سپییه و خەتی باریکی تێدایه. دندووکی تا ڕادەیەک درێژه و سەری بۆ لای خوارەوه شۆڕه. زستانان پشتی بۆری ئاماڵ قاوەیی و ڕێ ڕێیه، بەرزگی سپییه. باڵی خەتی سپی پێداهاتووه. لەکاتی چینه خۆ کوورِ دەکا. له قەراغ دەریا و ئاوگر و گۆلاوان دەژی. (133)

شێلاقه-ی چلێپاوان (233)

آبچلیک تک زی

Tringa ochropus

Chevalier cul-blanc

Green Sandpiper

٢٢ سانتیمێتره. باڵ و پشتی ڕەشه، ئاتەگی سپییه. مل و سینگی ڕێ ڕێی قاوەیی ئاماڵ بۆره. باڵی ساکاره. هاوینان پشتی خاڵی سپاتی لێ پەیدا دەبێ. زستانان ئەو خاڵانه کاڵ دەبنەوه. لاقی کەسکه. بەتاق دەژی، زیاتر خۆ له چاوان حەشار دەدا. سەر و کلکی دەجوولێنێتەوه. له کەنار زۆنگ و جۆبار و دەریاچەکان دەبینرێ. (136)



شێلاقه-ی خاڵخاڵ (234)

آبچلیک خالدار

Tringa glareola

Chevalier sylvain

Wood Sandpiper

٢٠ سانتیمێتره. پشتی هاوینان قاوەیی ئاماڵ زەیتوونییه و پڕه له خاڵی سپی. سەر، مل و سینگی ڕێ ڕێیه. برۆی سپییه. لەکاتی فڕین دامێنی سپی دەردەکەوێ، ژێر باڵی زەردواشه. لاقی درێژ و زەرد ڕەنگ یان کەسکی ئاماڵ زەرده. خاڵی بەدەنی زستانان کاڵتر دەنوێنێ. له زەل و گۆل و کەنار دەریاچەکان دەبینرێ. (136)

شێلاقه-ی دندووک پان (235)

تلیله نوک پهن

Limicola falcinellus

Bécasseau falcinelle

Broad-billed Sandpiper

١٦ سانتیمێتره. لاقی کورت و دندووکی درێژ و ئەستوور و خواره. کاتی هێلکه و جووچکه ڕەنگی پشتی توندتر دەبێ. برۆی سپی و دوو لکه. بەرسینگی خەنەیی ڕێ ڕێیه، بەرزگ و تەشک و داوێنی سپییه. زستانان پشتی بۆر هەڵدەگەڕێ. له زەلی سوێر، چلێپاو و کەنار دەریا دەبینرێ. (134)

شێلاقه-ی دندووک قیت (236)

آبچلیک نوک سربالا

Xenus cinereus

Bargette du térek

Terek Sandpiper

٢٢ سانتیمێتره. دندووکی درێژ و قیت و بۆره. زستانان سەر و پشتی کاڵه، هاوینان ئاماڵ قاوەییه و دوو خەتی ڕەشی نالێکی لەسەر پشتی پەیدا دەبێ. بەرزگی سپییه و ڕێ ڕێی کەم ڕەنگی لەسەر مل و سینگی هەیه. لەکەنار چۆماو، شۆرەکات و دەریا دەبینرێ. (136)

شێلاقە-ی ڕەش باو (237)

آبچلیک دودی
Tringa erythropus
Chevalier arlequin
Spotted Redshanh

**٣٠** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی ئامالّ ڕەشە؛ خاڵی سپی لەپشتی دایە. لە دوورەوە بەرزگی بۆر دەنوێنێ. کلکی ڕێ ڕێیە. باڵی خەتی پێداکشاوە. لەکاتی فڕیندا لاقی لە کلکی تێدەپەڕێ. لاقی هاوینان سوور و زستانان نارنجییە. دەنگی تایبەتی خۆی هەیە. لە گۆلاو و زۆنگ و شۆرەکاتان دەبینرێ. (135)

شێلاقە-ی شێ ڕەنگ (238)

تلیله بلوطی
Calidris ferruginea
Bécasseau cocorli
Curlew Sandpiper

* توریێ (؟)

**١٨** سانتیمێترە. سووری خەنەییە. سەر و پشتی پڕە لە خاڵی ڕەش. زستانان ئاتەگی سپی هەڵدەگەڕێ. دندووکی خوار و درێژ و باریکە. خەتی سپی بەباڵیدا کشاوە. بەرزگی خەتی وردی سپی تێدایە. زستانان بەرزگی بۆر هەڵدەگەڕێ. لەکەنار دەریا، ئاودڕ و گۆلاواندا دەژی. (133)

شێلاقە-ی کلک سپی (239)

تلیله دم سفید
Calidris temminckii
Bécasseau Temminck
Temminck’s Stint

**١٤,٥** سانتیمێترە. پشت و سینگی بۆرە. کردەوە و دەنگی لە هاوچەشنەکانی تری جیاوازە. خەتی سپی کاڵی بەباڵیدا هاتووە. شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. لە نزیکەوە قاچی قاوەیی یان کەسکە. لە زەل و گۆلاوی پڕ گیاوگۆڵ دەژی. تەنانەت لە شۆرەکات و ئاودڕاندا دەبینرێ. (134)



شێلاقە-ی لاق سوور (240)

آبچلیک پا سرخ
Tringa totanus
Chevalier gambette
Redshank

**٢٧** سانتیمێترە. سەرپەڕی ئەستوورایی پاڵ و پاشەڵی سپییە. لاقی سووری نارنجین. دندووکی سوورە و سەری دندووکی ڕەشە. ڕەنگی پشتی ڕەش و بۆری تێکەڵاوە. کلکی ڕەش و سپی ڕێ ڕێیە. بەرزگی پڕ خەت و خاڵە. بەباڕی لاقی زەردی نارنجییە و پشتی زەردی کاڵە. لەناو گۆل و زەل و گیا و شۆرەکات و زۆنگاندا دەبینرێ. لەنێو گیاوگۆڵ هێلانە دەکا. زستانان زۆر دەبن. (135)

شێلاقە-ی لاق کەسک (241)

آبچلیک پاسبز
Tringa nebularia
Chevalier aboyeur
Greenshank

**٣٠** سانتیمێترە. بەرزگی سپییە. لاقی درێژ و شینە و کاتی فڕین لەکلکی درێژتر دیاری دەکا. دندووکی ڕەش و کەمێک قیتە. زستانان ڕەنگی ئەم باڵندەیە کەمێک کاڵ دەبێ. لە گۆل و گۆلاوی تفت و قەراغ چیمەن و ڕووناوان دەژی. هەر لەو شوێنانەش لەناو گیاوگۆڵ هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر دەبێ و کۆچەرییە. (135)

قوڕاویلکە-ی بچووک (242)

پاشلک کوچک
Lymnocryptes minimus
Bécassine sourde
Jack Snipe

**١٩** سانتیمێترە. بەهۆی چووکی لەشی لە ئەوانی تر دەناسرێتەوە. دندووکی قوڵەتر و فڕینی هێدیترە. کاتی هەست بەمەترسی کردن زۆر درەنگ لە شوێنی خۆی هەڵدەفڕێ. لە زەل و گۆل و ئاوگراندا دەژی. (146)

قوڕاویلکە–ی تاق (243)

پاشلک تک زی
Gallinago solitaria
Bécassine solitaire
Solitary Snipe

**٢٣,٥** سانتیمێترە. لە قوڕاویلکەیی ناوینە گەورەترە. پەڕ و باڵی لەو کاڵتر و بۆرترە. سەری کلکی خڕە. بەرزگی خەت خەتە. تەنیا دەژی. زیاتر سیوادی بەیانی یان نوێژی شێوان دەست بەجم و جۆڵ و ڕاو دەکا. لەخیزەڵان و بەستێنی جۆ و جۆباری قەراغ شاخان و هەروەها بەردەڵانی زنەداری کێوان دەژی. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (148)

قوڕاویلکە–ی گەورە (244)

پاشلک بزرگ
Gallinago media
Bécassine double
Great Snipe

**٢٨** سانتیمێترە. پشت و زگی ڕێ ڕێیە. دندووکی لە قوڕاویلکەی ناوینە قوڵەترە بەڵام بنی دندووکی ئەستوورترە. کاتی فڕین سپیایی کلکی بەجوانی دیارە. زۆر ئارام و ڕاست دەفڕێ. باڵی کەمێک کووڕن. زۆرتر لە پەرێز و زەویوزاری ئیشک دەبینرێ. کۆچەرییە. (146)

قوڕاویلکە–ی ناوینە (245)

پاشلک معمولی
Gallinago gallinago
Bécassine des marais
Snipe

**٢٦** سانتیمێترە. باڵندەی زۆنگ و زەلانە، ڕەنگی قاوەیییە، دندووکی درێژ و ڕاستە. زیاتر خۆ نەدیو دەکا. لەکاتی فڕین خوارە و پێچە دەکا؛ هەروەها دەنگی لە زیقاوە دەچێ. پشتی شێ ڕەنگە. سەری کلکی سپییە. دندووکی لە کاتی فڕیندا بەرەو خوار ڕادەگرێ. لەدەستەی بچووکدا دەگەڕێن. لە زەل، زۆنگ و نەرمانی زنەداردا دەژین. (146)



مرەلارە (246)

ابیا
Scolopax rusticola
Bécasse des bois
Woodcock

**٣٤** سانتیمێترە. لە لێڕەوار بەتەنیا دەژی. بەهۆی ئەوەی کە ڕەنگی گەڵای وشکی دارانە و کەمتر جووڵە دەکا نابینرێ. بەرزگی ئاماڵ زەردی ڕێ ڕێیە. لاجانگ و پاشەستۆی خەتی ڕەشی لێیە. بەڕۆژ ناگەڕێ. سیوادی بەیانی یان نوێژی شێوان ڕاو دەکا. لە شوێنی پڕ دار بەتایبەت جێی شەداری پڕ گیاوگۆڵ دەژی. (146)

## تۆرەمەی فیسقە (30F)
Family TROGLODYTIDAE

* چۆلەکەمشکە، فیرنەگولە، کەڵەفندە

فیسقە (247)

الیکائی
Troglodytes troglodytes
Troglodyte mignon
Wren

**٩** سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. باڵندەیەکی بچووکی خڕپنەیە، پەڕ و باڵی ڕێ ڕێی قاوەیییە، کلکی کورت و قیتە. حەجمینی نییە. وەک مشک بەنێو گەڵا و بەرگی گیا و داران لە خواردەمەنی دەگەڕێ و مێش و مەگەزان دەگرێ. هەمیشە لەژێر گیاوگۆڵی نزیک ئاو دەژی. هێلانەی خڕی خۆی لەنێو پەرژین و کونەداری کەنار ڕووبار و خانووی نزیک ئاوان دەکا. (242)

## تۆرەمەی قورینگ (31F)
Family GRUIDAE

* شینەقورینگ، قازقولینگ، قازوقولەنگ، قازی قولەنگ، قازی قوڵەنگ، قازی قوڵینگ، قولنگ، قولینگ، قوڵینگە، قەتارقوڵینگ

گەورەن، لاق و ملیان درێژە، کلکیان تا ڕادەیەک قوڵەیە، باڵیان درێژە، دندووکیان درێژ و ئەستوورە و لەهی لەگ لەگ دەچێ. شاباڵی دواوەیان بەسەر کلکیاندا کشاوە، نێرە و مێیە یەک ڕەنگن. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: شینە قورینگ، قڕ قڕ.

شینەقورینگ (248)

**درنا**
Grus grus
Grue cendrée
Crane

**١١٢** سانتیمێترە. شینی سوورمەیییە، سەری کلکی ڕەشە. خەتێکی سپی لە لاجانگیەوە دەست پێدەکا بەملیدا هەتا سەر شانی دەڕوا. لە نیزیکەوە نێوچاوانی سوور دەنوێنێ، دندووکی لەهی لەگ لەگ و شاوە کورتترە. زۆر سڵە، لەسەرەخۆ و هێدی هەنگاو دەنێ. کەم وا هەیە لەسەر دار بنیشێ. لەکاتی هەست بەمەترسی کردن سەر هەڵدێنێ و ملی ڕادەکێشێ. بەگەل دەگەڕێن. کاتی لەوەڕ نێرە دەبێ بەکێشکچی. دوور لە جەنگەڵ و دارستان، لەقەراغ چەم و گۆلاو و ناو زەویوزاران دەژی. زستانان زۆر هەیە. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. کۆچەرییە. (111)

قڕ قڕ ( 249)

**درنای کوچک**
Anthropoides virgo
Demosielle de Numidie
Demoiselle Crane

**٩٥** سانتیمێترە. کاکۆڵی هەیە و بەلاملیدا هاتۆتە خوار. ڕەنگی بۆری شین باوە. سەر و مل و بەرسینگی ڕەشە. لە دەشت و بانوان لەکەنار ئاوی شیرن دەبینرێ. کار و کردەوەی لە شینەقورینگ دەچێ. کۆچەرییە (111)

## **تۆرەمەی قوڵتە** (32F)
Family SITTIDAE

* بەربەقوڕە (؟)، بەرکوڕە (؟)

وەک دارکونکەرەی چووکە دەچن. لەسەر دار و ڕەوەزان بێ ئەوەی کەڵک لە کلکیان وەربگرن بۆ سەرەوخوار دەتوانن بێن و بچن. سەریان گەورەیە. دندووکیان قەوییە، لاقیان کورتە، پەنجەیان درێژە و باڵی درێژ و نووک تیژیان هەیە. بەتەنیا دەژین. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە کوناندا هێلانە دەکەن. زیندەوار و دانەوێڵە دەخۆن. بریتین لە: بەردەوان. قوڵتەی بچووک، قوڵتەی جەنگەڵی، قوڵتەی گەورە.



بەردەوان (250)

**دیوارخزک**
Tichodroma muraria
Tichodrome échelette
Wall Creeper

**١٦** سانتیمێترە. باڵی سوورە و شاباڵی ڕەشە. خاڵی سپی سپی لەسەر شاباڵی هەیە. پشتی بۆر و کلکی کورت و دندووکی درێژ و خوار و باریکە. مل و سینگی هاوینان ڕەش و زستانان ئاماڵ سپییە. هەڵفڕینەکەی وەک پەپوولە دەچێ. کاتی گەڕان بەشوێن خواردەمەنی لەسەر ڕەوەز یان کۆنە خانووان باڵی فش دەکا و لێکیان دەدا. بەباڕی وەک ڕەنگی زستانی ئەو باڵندەیە دەچێ، بەڵام قاوەییە و دندووکی ڕاستترە. لە دۆڵ و دەرەی بەردەلان، ڕەوەز و کۆنە خانووان دەژی، زستانان لە دۆڵی بەردەلان و داوێنی کێوان ڕایدەبوێرێ. (316)

قوڵتە-ی بچووک (251)

**کمرکلی کوچک**
Sitta neumayer
Sittelle de rochers de Neumayer
Neumayer’s Rock Nuthatch

**١٤** سانتیمێترە. زۆرتر لەسەر ڕەوەزی ڕووتەن دەبینرێ و جار جار لە سەر دار دەنیشێ. پشتی بۆری ئاماڵ سپییە. تەنیشت و ژێر پاشەڵی زەردگوێزییە. کلکی تەواو بۆرە. کردەوەی وەک قوڵتەی جەنگەڵییە. لە دۆڵ و دەرەی تەنگ و بەردەلان، لە داوێنی کێوان و ڕەوەزی بڵیند دەژی. لە غار و کونی بەردان هێلانە دەکا و زارکی هێلانە بەقوڕ سواغ دەدا و لە گوێن سەرە زوڕنای لێدەکا. (316)

قوڵتە-ی جەنگەڵی (252)

**کمر کلی جنگلی**
Sitta europaea
Sittelle torchepot
Nuthatch

**١٣** سانتیمێترە. بەدار هەڵدەچێ. دندووکی قەوی و تیژە. سەر پشتی بۆری ئاماڵ شینە. بەرزگی ئاماڵ زەردە و تەنیشتی مەیلەو شێیە. لاجانگ و ملی سپییە. خەتی چاوی ڕەشە. بەباڕی ڕەنگی شێی نییە. لەسەر دار بۆ هەموو لایەک دێ و دەچێ. دەنک و کاکڵی میوەی ئیشک لەژێر پێستی دار ڕۆ دەکا و بەدندووک دەیکوتێ لەسەر

داری گەورە و کۆنی جەنگەڵ و پارکان دەژی. لە کونی دار و دیواران هێلانە ساز دەکا و زارکی هێلانە بەقوڕ سواغ دەدا. (316)

قوڵتە-ی گەورە (253)

کمر کلی بزرگ

Sitta tephronota

Sittelle de rochers

Large Rock Nuthatch

١٦ سانتیمێترە. دندووکی لە قوڵتەی بچووک درێژتر و ئەستوورترە. سینگی سپیتر و ڕەنگی خورمایی تەنیشتی توندترە. خەتی چاوی بەرچاوترە و هەتا پاش ملی کشاوە. کردەوەی وەک قوڵتەی بچووک دەچێ. شوێنی ژیان و هێلانەکردنی وەک قوڵتەی بچووکە. (314).

## تۆرەمەی قوڵەجووقە (33F)
Family MUSCICAPIDAE

*** قوڵەچەقە**

ئەم باڵندانە زۆرتر لەسەر دار دەژین. لە شوێنی بڵیند، قیت هەڵدەنیشن. هەر لەوێوە بۆ گرتنی نێچیر دێنە فڕین. هەر کە نێچیریان ڕاو کرد، دەگەڕێنەوە جێی هەوەڵێ. بەتەنیا دەژین. بێجگە لە قوڵە جووقەی خاڵخاڵ ئەوانی تر نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە کون یان سەر دار هێلانە ساز دەکەن. مێش و مەگەز و جاڵجاڵووکە ڕاو دەکەن. بریتین لە: قوڵەجووقە، قوڵەجووقەی خاڵخاڵ، قوڵەجووقەی سینگ سوور، قوڵەجووقەی نێوچاوان سپی.

قوڵەجووقە (254)

مگس گیر ابلق باختری

Ficedula hypoleuca

Gobe-mouches noir

Pied Flycatcher

١٢٫٥ سانتیمێترە. نێرە لە بەهاردا سەر و پشتی ڕەشە. نێوچاوان و بەرزگ و خاڵی باڵ و دەوری کلکی سپییە. لە پایزدا وەک مێیە دەچێ (تەنیا سپیایی نێوچاوانی دەمێنێ). مێیە پشتی قاوەیی زەیتوونییە و بەرزگی ئاماڵ زەردە. خاڵی سەر باڵی بچووکترە. ڕاو کردنی هەر وەک قوڵەجووقەی خاڵخاڵە، بەڵام ناگەڕێتەوە شوێنی



هەوەڵێی. زۆرتر لەسەر عەرز چینە دەکا. خێرا خێرا کلکی هەڵدەتەکێنێ. لەباغ و لێڕەواری نزیک ئاو دەژی. (273)

قوڵەجووقە-ی خاڵخاڵ (255)

مگس گیر خالدار

Muscicapa striata

Gobe-mouches gris

Spotted Flycatcher

١٣٫٥ سانتیمێترە. قیت هەڵدەنیشێ. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. سەری خاڵخاڵە، سینگی سپی ڕێ ڕێیە. باڵ و کلکی خۆی زۆر دەجووڵێنێتەوە. بەتەنیا دەژی. لەسەر لکی نەزۆر بەرزی داران هەڵدەنیشێ و هەر لەوێوە بۆ گرتنی مێش و مەگەز دێتە فڕین. لە نێو باغ و لێڕەواران دەژی. لەسەر خانوو، باغ و پەسیوی پنچکی بەرز هێلانە ساز دەکا، هاوینان زۆرە. (273)

قوڵەجووقە-ی سینگ سوور (256)

مگس گیر سینه سرخ

Ficedula parva

Gobe-mouches nain

Red-breasted Flycatcher

١١٫٥ سانتیمێترە. نێرە پشتی قاوەیی ئاماڵ بۆرە و بەرزگی زەردی کاڵە. لەهەر چوار وەرزاندا گەرووی نارنجییە و سەری بۆر. کلکی ڕەشە و دەوری سپییە. لەکاتی هەڵنیشتندا کلکی قیت ڕادەگرێ و باڵی شۆڕ دەکاتەوە. لە وەرزی هێلکە و جووچکەدا گۆشەگیر دەبێ. لەناو لێڕوار و زەویوزاراندا دەبینرێ. خوو و خدەی هێلانە سازکردنی وەک قوڵەجووقەی نێوچاوان سپی دەچێ، بەڵام جاری وایە هێلانەی سەر ئاوالا لەسەر دار ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (273)

قوڵەجووقە-ی نێوچاوان سپی (257)

مگس گیر ابلق

Ficedula albicollis

Gobe-mouches á collier

Collared Flycatcher

هەر وەک قوڵەجووقە دەچێ، بەڵام نێرەیان نێوچاوان و مل و ئاتەگی سپیترە، خاڵی سەر باڵ و سپیایی دەوری کلکیشی کەمترە. لە پایزدا نیشانە ڕەشەکانی دەبنە قاوەیی

پڕ ڕەنگ، سپیایی ملی لەناو دەچێ، سپیاییەکانی تری لە کەمی دەدەن و زۆر وەک
مێیەی قولەجووقە دەچێ. کردەوە و شوێنی ژیانی وەک هی قولەجووقەیە، هاوینان
زۆرە. (273)

## **تۆرەمەی قولەشینە** (34F)
Family ALCEDINIDAE

* مایس چنە (؟)

ئەم باڵندانە سەریان گەورەیە و کلکیان کورتە. بۆ ڕاوکردنی ماسی خۆ دەخەنە ناو ئاو؛ لەژێر ئاو بینە دەکێشن. دندووکیان گەورە و ڕاست و نووک تیژە. زۆرتریان باڵیان کورت و خڕە. پەڕ و باڵی جوان و خاسە ڕەنگیان هەیە. بەبێ جووڵە لە شوێنی بڵیندی وەک دارتێل یان ئەو جێیانەی بەسەر ئاودا دەڕوانن دەمێننەوە؛ جاری وایە لەسەر ئاو لەنگەریش دەگرن. بەتەنیا دەژین. لە کونادا هێلانە دەکەن. ماسی، شەیتانۆکە، جرۆجانەوەر و بۆق دەخۆن. بریتین لە: قولەشینە، قولەشینەی بەڵەک، قولەشینەی سینگ سپی.

قولەشینە (258)

ماهی خورک کوچک
Alcedo atthis
Martin-pêcheur d'Europe
Kingfisher

١٦ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. پشتی شینی ئاماڵ سەوزە. گەرووی سپییە. لاملی خاڵی سپی تێدایە لاجانگ و بەرزگی شێ ڕەنگە. دندووکی درێژ و خەنجەرییە. سەری گەورەیە، باڵ و کلکی کورتە. لاقی سوورە. سڵە، کاتی هەڵنیشتن سەر و کلکی هەڵدەتەکێنێ. بۆ گرتنی ماسی و زیندەوار خۆ دەخاتە ناو ئاو و بینە دەکێشێ. جاری وایە پێش خۆ خستنە ئاو لەنگەر دەبەستێ. بەتەنیا دەژی. لە جۆگە و جۆبار و شوێنی پڕ ئاو دەبینرێ. زستانان لەکەنار دەریا و تالاوان دەژی. لە کوندا هێلانە ساز دەکا. (196)



قولەشینە-ی بەڵەک (259)

ماهی خورک ابلق
Ceryle rudis
Martin-pêcheur pie
Pied Kingfisher

٢٦ سانتیمێترە. بەڵەکە، دندووکی گەورەیە و کاکۆڵی پرش و بڵاوە. نێرە دوو خەتی ڕەشی بەسینگدا کشاوە و مێیە یەک خەت. لەسەر ئاو لەنگەر دەبەستێ و بەمەبەستی گرتنی ماسی لوور دەبێتەوە ناو ئاو. لە دەوروبەری چۆم. مردوواو و ئاودڕاندا دەژی. لە ئاوی سوێر و شیرندا ماسی دەگرێ. لە کوندا هێلانە دەکا. زۆر هەیە. (196)

قولەشینە-ی سینگ سپی (260)

ماهی خورک سینه سفید
Halcyon smyrnensis
Martin-pêcheur de Smyrne
White-breasted Kingfisher

٢٧ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک جۆرن. دندووک و لاقی سوورە. چەنە، گەروو و بەرسینگی سپییە. قیت لەسەر دارتێل و شوێنی بەرز هەڵدەنیشێ. لە جۆبار، زەل و زەوی کەشاو دەبینرێ. لە کوندا هێلانە ساز دەکا. (196)

## **تۆرەمەی قەرقاوڵ** (35F)
Family PHASIANIDAE

باڵندەی ئیشکایین. لاقیان تووکی نییە، باڵیان کورتە. کاتی فڕین فڕەی باڵیان دێ. قەرقاوڵ گەورە و کلک درێژە، پۆڕ و کەو نێونجین، هەوێردە بچووکترە. زۆرتر بەپۆل دەگەڕێن. هێندێکیان نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە دانەوێڵە، مێش و مەگەز، کرم و... چینە دەکەن. بریتین لە: پۆڕ، زڕەپۆڕ، زڕەکەو، سوێسکە، قەرقاوڵ، کەو، کەوەدەری، هەوێردە، هەوێردەی پنچکان.

پۆڕ (261)

دراج
Francolinus francolinus
Francolin noir
Black partridge

* ئاڤدەل (؟)، ئایکناسە (؟) پوور، دوراج، زێوەکەو، مریشکی دەشت (؟)

٣١ سانتیمێترە. نێرە ڕەشی خاڵخاڵە، ملی قاوەیییە، پاش ملی خورمایییە، خاڵی

سپی لەژێر چاوە. نێرە و مێیە تووکی تەنیشت کلکیان ڕەشە. جووت جووت دەبینرێن. مێیە قاوەیی ڕێ ڕێیە، لاقی سوورە. پۆڕ زۆرتر خۆ حەشار دەدا، لەناو گەز و گیا دەژی. لەسەر عەرز لەناو گیادا هێلانە دەکا. (109)

زرەپۆڕ (262)

جیرفتی
Francolinus pondicerianus
Francolin gris
Grey partridge

**٢٩** سانتیمێترە. نێر و مێیەی یەک ڕەنگە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆری خەت خەتە. بەرزگی قاوەیی مەیلەو زەردی خەت خەتە. چەنە و گەرووی زەردی کاڵە. لاقی سوورە. کردەوەی لە پۆڕ دەچێ. لەسەر عەرز لەژێر پنچ و قۆپەن هێلانە ساز دەکا. (109)

زرەکەو (263)

کبک چیل
Perdix Perdix
Perdrix grise
Common partridge

* جرەکەو (؟)، کەواچور، کەواچیر

**٣٠** سانتیمێترە. باڵی کورتە، کلکی کورت و خورمایی ڕەنگە. نێرە بەرزگی خاڵی قاوەیی لێیە (هی مێیە کەم ڕەنگترە). سەرپشتی ڕێ ڕێیە. زرەکەو لەکاتی پێڕۆ خۆ کۆم دەکا. هەر کە هەستی بەمەترسی کرد خۆ بەعەرزەوە مەلاس دەکا و ئامادەی فڕین دەبێ. لەناو شیناوەرد، بەیار، لەوەڕگە و... دەبینرێ. هێلانەی خۆی لە جێی ئەستەم و حەشارگەی وەک پەرژین، ناو گەنم و گەنمەشامیدا ساز دەکا. (110)

سوێسکە (264)

تیهو
Ammoperdix grisogularis
Perdrix á gorge grise
See-see partridge

* تەیهوو، تێ (؟)، سوسکە، سۆس، سۆسک، سۆسکە، سووسک، سووسی، سێچکە، سێسکە، شووشک (؟)، کاسەکەو (؟)، گەڤریلە (؟)، مارەکەو (؟)

**٢٣** هەتا **٢٥** سانتیمێترە. مێیە پشتی قاوەیی تۆڵخە، خەتی وردی بۆری تێدایە،



بەرزگی قاوەیی کاڵە. سوێسکە چەند خەت لە تەنیشتیدا دەبینرێ، مل و بەرچێڵەی بۆرە، دەوری چاوی قەیتانێکی پان و سپی هەیە، لەلای سەرەوە ڕەش هەڵدەگەڕێ، کلکی خورماییە، هەروەها لە قەراغ چۆم و جۆباران دەبینرێ. لەسەر عەرز هێلانە دەکا. (109)

قەرقاوڵ (265)

قرقاول
Phasianus colchicus
Faisan commun
Pheasant

* تەرەزوو، چوڕ، چوڕپۆڕ، چۆڕ، کەڵەشێری کێوی (؟)

نێرە **٧٥** هەتا **٨٧** و مێیە **٥٣** هەتا **٦٢** سانتیمێترە. نێرە کلک و دندووکی درێژە، پەڕ و باڵی ڕەنگاوڕەنگە، سەری مێیە قاوەیی کاڵی خاڵخاڵە، کلکی لەهی نێرە کورتترە. قەرقاوڵ لەکاتی مەترسیدا کەم وا هەیە هەڵفڕێ، زۆرتر هەڵدێ و خۆ حەشار دەدا. بەفڕەفڕ هەڵدەفڕێ، نەوی دەفڕێ. لە جەنگەڵ و مەزار و قامیشەڵاندا دەژی. لەسەر عەرز لە بن پنجە گیا هێلانە دەکا. (110)

کەو (266)

کبک
Alectoris chukar
Perdrix Chukar
Chukar partridge

* خاسەکەو، زارانج (؟)، ژەرژی، ژەرەژ، کۆ وک، کەبک، کەڤ، کەوک، کەوگوێزەل.

**٣٣** سانتیمێترە. پشتی بۆرە، باڵی ڕێ ڕێیە، دندووک و لاقی سوورە. تووکی قەراغ کلکی خورماییێن، زۆرتر بەجووت یان لە دەستەی چووکدا دەبینرێ. زستانان دەستەیان زۆرتر دەبێ. لەکاتی مەترسیدا کەم وا هەیە هەڵفڕێ، یان خۆ حەشار دەدا یان بەرەو هەوراز ڕا دەکا. بەهار و هاوینان زۆرتر دەخوێنێ. لە نواڵان لەناو بەردان دەبینرێ. زۆرتر بەیانە و ئێواران دێتە سەر کانیاوان. لەناو بەرد و پنچکان هێلانە ساز دەکا. (109)

کەودەری (267)

**کبک دری**
Tetraogallus caspius
Tétraogalle de la Caspienne
Caspian Snowcock

* کەودەر

نێرە **٥٨** و مێیە **٥٥** سانتیمێترە. لە کێوی بەرز دەژی، تەنانەت زستانانیش کەم وا هەیە لەو شوێنانە بێتە خوار. پەڕ و باڵی بۆرە، پڕە لە خەتی قاوەیی و سپی. بەرزگی کاڵترە. سەری شاباڵی زۆربەی سپییە. بەرچێلەی سپییە. سەری بۆرە. باڵندەیەکی زۆر سڵە، لەکاتی مەترسیدا مەودایەکی زۆر دەفڕێ. جووت جووت دەگەڕێن. لە ڕەوەز و هەڵدێران، لووتکەی بەرزی کێوان دەبینرێ. لەسەر عەرز لەجێی بەردەڵان لە شوێنی بڵیند هێلانە ساز دەکا. (100)

هەوێردە (268)

**بلدرچین**
Coturnix coturnix
Caille des blés
Quail

* بدبەدە، بەتەک (؟)، سەمانەک، فیلەگێژە، قارووتک، قورقرۆک، کولەفر، کولەفڕ، کوڵەفڕ، کەراک، کەراکە، کەرواڵە، کەرۆڵە، کەرەک، کەرەواڵە، کەرەوانە، کەرەوەرە،کەرەوەلە، کەهرە، کیراسو، وەتەک (؟)، هەڤردە

**١٧** سانتیمێترە. بەدەنگی دەناسرێتەوە، بۆرە، پشتی ڕێ ڕێی قاوەیی کاڵ و ڕەشە، بەرزگی کەم ڕەنگترە. نێرە بەرچێلەی ڕەشە. مێیە سینگی خاڵ خاڵە. هەوێردە باڵێک دەفڕێ. لەکاتی کورک بووندا کەمتر دەفڕێ، زۆرتر خۆ حەشار دەدا. کەم وا هەیە بێتە جێگای ڕووت. زۆرتر لەناو گیاوگۆڵ و گەنم و جۆ و... دەژی و هێلانە ساز دەکا. (110)

هەوێردە–ی پنچکان (269)

**بلدرچین بوتەای**
Turnix sylvatica
Turnix d’Andalousie
Andalusian Hemipode

**١٥** سانتیمێترە. سەری بۆرە، تەپڵی سەری خەتی مەیلەو زەردی پێداهاتووە. سینگی



خورمایی ڕەنگە. تەنیشتی خاڵخاڵە، چاو و ئاڵقەی دەوری چاوی شینە. نێر و مێیەی لێک دەکەن. بەدایم خۆی حەشار دەدا. توند ڕا دەکا. نەوی دەفڕێ. هەتا مەجبوور نەبێ نافڕێ. لە بەیاران، زەویوزاری پڕ گیا، پەرێز و... دەبینرێ و هێلانە ساز دەکا. (110)

## تۆرەمەی قەرەناز (36F)
Family THRESKIORNITHIDAE

لە تۆرەمەی شاوە و لەگ لەگ دەچن. بەعزێک دندووکیان خوارە، وەک قەراناز، دندووکی جۆرێکیشیان پانە، وەک دندووک بێڵە، لەکاتی فڕیندا ملیان ڕاست ڕادەگرن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. زۆرتر بەپۆل دەژین. لە قامیشەڵان، ناو گیاوگۆڵ و سەر دار هێلانە ساز دەکەن. بەماسی، مێش، مەگەز، دانەوێڵە و گیانلەبەرانی وردی ناو ئاو بەڕێدەچن. سێ جۆری ناسراوە: دندووک بێڵە، قەرەناز، قەرەنازی ئەفریقایی.

دندووک بێڵە (270)

**کفچەنوک**
Platalea leucorodia
Spatule blanche
Spoonbill

**٥٨** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی سپییە. دندووکی درێژە. سەری دندووکی پانە. دندووک و لاقی ڕەشن. سەری دندووکی زەردە. بەگەل دەژین. لە تەنکاوان ماسی، بۆق و شینکە دەخۆن، ناوەکەی لەشکڵی دندووکی وەرگیراوە. نێرەکەی سەری بەکڵاوەیە. کۆچەرییە. لەناو گیاوگۆڵ هەروەها لەسەر داریش هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (50)

قەرەناز (271)

اکراس سیاه
Plegadis falcinellus
Lbis falcinelle
Glossy Ibis

**٥٥** سانتیمێترە. لاقی درێژە و لە دوورەوە ڕەش دەنوێنێ. دندووکی درێژ و خوارە. پەڕ و باڵی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. باڵ و کلکی مەیلەو کەسکن. لەسەر دار و قامیش دەنیشێ. زستانان زۆر دەبێ. بێچووەکەی قاوەیییە. لە زەل و گۆلاو و تەنکاوان بەگەل دەژی. زۆرتر لەگەڵ شاوە و لەگ لەگ دەبینرێ. لەناو گیاوگۆڵ و سەر دار هێلانە ساز دەکا. کۆچەرییە. (50)

قەرنازە-ی ئەفریقایی (272)

اکراس افریقائی
Threskiornis aethiopicus
Ibis sacré
Sacred lbis

**٦٥** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی سپییە، سەر و ملی ڕەش و بێ تووکە. سەری شاباڵی ڕەشە. دندووکی هەم خوار و درێژە هەم ئەستوور. لاق و کلکی ڕەشە لە تاڵاو و گۆڵ و زەلاندا دەژی. (50)

## **تۆرەمەی قەل** (37F)
Family CORVIDAE

* قاڵاو، قەرپلاش، کلاق، کەلاخ، کەلەڕەش

لاق و باڵیان بەهێزە، هەروەها دندووکیشیان درێژ و قەوییە. بەگەل دەژین. زۆربەیان شەڕانین. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. لەسەر دار، ڕەوەز و کوناندا هێلانە ساز دەکەن. هەموو شتێک دەخۆن. زۆرتر هێرش دەبەنە سەر هێلکە و جووچکەی باڵندەکانی تر و دەیانڕفێنن. بریتین لە: قاژوو، قاژوو دندووک زەردە، قاژووەمەڕە، قژاوکە، قشقەڵە، قشقەڵەسوورە، قەلەبەڵەکە، قەلەڕەشە، قەلەگورگە.

قاژوو (273)

کلاغ سیاه
Corvus frugilegus
Corbeau freux
Rook

* قاژ، قاژەسیاوی، قاژیی، قاش، قاقیشک (؟) قیژ، کۆربەڵا (؟)، کۆقژک (؟)، کەوقژک.

**٤٥** سانتیمێترە. بەدەنی تەواو ڕەشە. دەم و چاوی بێ تووکە. دندووکی ڕەشە، بەڵام ئەستوورایی دندووکی ئاماڵ سپییە. لەکاتی پیرۆدا تووکی ڕانی قرژ دەبنەوە، بەباری دەم و چاوی تووکنە و لەشی ڕەشترە. لەو زەویوزارانەی کە داریان تێدایە دەژی. بەگەل لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (241)



قاژووە دندووک زەردە (274)

زاغ نوک زرد
Pyrrhocorax graculus
Chocard á bec jane
Alpine Chough

**٣٨** سانتیمێترە. دندووکی زەردە. لاقی سوورە. پەڕ و باڵی ڕەشە. بەباری لاقی ڕەشە و هەروەها پەڕ و باڵیشی ڕەشترە. کردەوەی هەروەک قاژووەمەڕیە. لە کێوان و دەشتان دەبینرێ. لە کۆنە بەرد و کۆنە هێلانانـدا هێلکە دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (232)

قاژووەمەڕە (275)

زاغ نوک سرخ
Pyrrhocorax pyrrhocorax
Crave á bec rouge
Chough

* قاژی دندووک سوور

**٣٩** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی کەوەی بریقەدارە. دندووکی درێژ و سوور و خوارە. قاچی سوورە. لە فڕیندا بەهێزە. لە کێو و ئەو ڕەوەزانەی بەرووکاری دەریادا دەڕوانن دەژی. لە کونە بەرد، لێوارەی هەڵدێر و نێو غاراندا هێلانە ساز دەکا. (232)

قژاوکە (276)

جی جاق
Carrulus glandarius
Geai des chênes
Jay

* بۆرەک، حەوت زمانکە، قژاکە، قژاڵکە

**٣٤** سانتیمێترە. لەشی قاوەیی کاڵە. ئاتەگی سپییە، کلکی ڕەشە و خاڵی سپی گەورەی لەسەر باڵی هەیە. شاباڵی ڕێ ڕێی شین و ڕەشە. تووکی سەری ڕەش بەڵەکە و جارجار جغە هەڵدەدا. چاوی شینی کاڵە. زۆرتر بەگەل دەژین، پڕ قاژ و قووڕن. لەسەر داران دەژی. لە لێڕەواری دوورە دەست هێلانە ساز دەکا. (232)

قشقەڵە (277)

زاغی
Pica pica
Pie bavarde
Magpie

* پەلەژارە (؟)، خەزال (؟)، ڕەڤشێلک (؟)، زاخی، غەلابازەلە، غەلەبازلە. قالاوەبازلە، قالاوەبازەڵە، قژکا شەیتانوک (؟)، قژکا گەوری قول (؟)، قژقژک، قژقژو، قژک، قژقیژوک، قژگە، قژیک، قشخەڵە، قشغرە، قشقرە، قشقەل، قشکەڵە، قشێرە، قولەبازەڵە، قەرەباچکە، قەژقەژک، قەلانچە (؟)، قەلقشک، قەلقیشک، قەلەباچکە، قەلەبازڵە، قەلەژارە (؟)، کلک گەزە، کەشکەرە، گەزبەتنە.

**٤٥** سانتیمێترە، پەڕ و بەڵی باڵەکە و کلکی درێژ. تووکی شان، تەنیشت و بەرزگی سپییە و شوێنەکانی تری لەشی ڕەشی بریقەداری ئاماڵ شین و کەسک و ئەرغەوانییە. زۆرتر بەگەل دەژی. زستانان لە دەستەی زۆرتردا دەبینرێن. لەنێو زەویوزار، شوێنی ئاواڵە و بەرفرەوانی پەرژیندار دەژی. لەسەر داری بڵیند، پنچکی دڕکاوی، پەرژین و گەوەڕی لێڕواران هێلانە ساز دەکا. زۆر جاران سەری هێلانەکەی بەپووشکە و لک و پۆی باریکی داران دادەپۆشی. (232)

قشقەڵە-ی سوورە (278)

زاغ بور
Podoces pleskei
Geai terrestre de Pleske
Pleske’s Ground Jay

**٢٤** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی زەردیلەیە. خاڵی ڕەشی بچووکی لە نێوچاواندا هەیە، هەروەها خاڵێکی گەورەی ڕەشی لە سینگیدا هەیە. باڵی ڕەشە و دوو خەتی باریک و پانی پێداکشاوە. کلکی ڕەشە. کەم وا هەیە بفڕێ؛ تەنانەت کاتێ کەوتە مەترسیش ڕا دەکا. زۆر وەک پەپووسێمانە و چورە دندووک درێژە دەچێ. لە دەشتی خیزەڵان کە جێ جێ پنچی لێ ڕوابێ دەژی. لە نێو پنچان هێلانە ساز دەکا. (231)

قەلەبەڵەکە (279)

کلاغ ابلق
Corvus corone
Corneille mantelée
Hooded Crow

* بۆرەپنە. غەلاخ، غەلاغ، قالاو، قالاولێنە، قالاوەبولێنە. قالاوەبۆرینە، قالاو، قژکابەڵەک، قەل، قەلەبانەیی، قەلە سابوونی.

**٤٧** سانتیمێترە. پشت و بەرزگی بۆرە، سەر و مل و باڵ و کلکی ڕەشە. لە دوورەوە بەڵەک دەنوێنێ. زۆرتر تەنیایە و جارجار بەجووت دەگەڕێن. لە شاران، گوندان، ناو زەویوزار و جەنگەڵاندا دەبینرێ. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا؛ لە ڕەوەزانیش هێلانەی بینراوە. (241)

قەلەڕەشە (280)

کلاغ گردن بور
Corvus monedula
Choucas des tours
Jackdaw

* چیق(؟)، قالاوەڕەشە(؟)، قالاوەبولکە(؟)، قرکاڕەش، قژیاک، قەلاسێلکە(؟).

**٣٣** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی ڕەشە. پاش مل، دەوروبەری گوێی و بەرزگی بۆریلەیە. ڕەنگی چاوی بۆری کاڵە. زۆرتر لەگەڵ قاژوو و سێرووان دەبینرێ. لە ڕەوەزی شاخان، سەر کۆنە خانووان و هەروەها نێو زەویوزاراندا دەژی. لە کونی دار و خانوو و ڕەوەزاندا هێلانە ساز دەکا. تەنانەت جاری واشە لە کونی سەر عەرز و سەر داریشدا هێلانە دەکا. (241)

قەلەگورگە (281)

غراب
Corvus corax
Grand corbeau
Raven

**٦٣** سانتیمێترە. دندووکی ڕەش و ئەستوور و گەورەیە. تووکی بەرچێڵەی قرژە. پەڕ و باڵی ڕەشە. دەنگی بۆڕە. لە فڕیندا بەهێزە. کاتی وەهێلکە هاتن لە حەوا تەقڵە لێدەدا. لەسەر دار و ئەو ڕەوەزانەی بەرووکاری دەریادا هەڵکەوتوون دەبینرێ. (241)

## تۆرەمەی قەل مراوی (38F)
## Family PHALACROCORACIDAE

* قەل مراو

باڵندەی ئاون، گەورەن، دندووک و کلکیان درێژە، پەڕ و باڵیان ڕەشە. پێ بەپەردەن، سەری دندووکیان خوارە. بەپۆل دەفڕن. لە کاتی وچان باڵیان فش

دەکەن و زۆرتر ڕەوەز و شوێنی بەرز بۆ حەسانەوە هەڵدەبژێرن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. لەسەر دار یان لە ڕەوەزان هێلانە ساز دەکەن. بەماسی و بۆق و شەیتانۆکە و گیانلەبەرانی ناو ئاو بەڕێدەچن. لە دوو جۆری گەورە و چووکەدا دەبینرێن. جۆرێکیشیان هەیە سەری سپییە.

قەل مراوی–ی بچووک (282)

باکلان کوچک
Phalacrocorax pygmaeus
Cormoran pygmée
Pygmy Cormorant

٤٧ سانتیمێترە. لەکاتی فڕیندا شێوەی ڕەش بەشە دەدا. پەڕ و باڵی کەوە ڕەنگی بەڵەکە. زۆرتر لە شوێنی وەک شام و کەنار چۆمدا دەژی. زۆر لەئاو دوور ناکەوێتەوە. بەپێچەوانەی قەل و مراوی گەورە، گەرووی سپی نییە. هێلانە لەسەر خیز یان خاکی قەراغ ئاو ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (30)

قەل مراوی–ی گەورە (283)

باکلان
Phalacrocorax carbo
Grand Cormoran
Cormorant

٩٠ سانتیمێترە. باڵندەی ئاوییە. زل و ڕەشە، لاجانگ و گەرووی سپییە. بەباڵی فشەوە هەڵدەنیشێ. لەکاتی فڕیندا بەڕێچکە دەکەونە دوای یەک. بەگەل دەژین. لە گەوەڕی دەریا، گۆل و گۆلاوان دەبن. لەسەر تاتەبەرد یان دوڕگەکانی ناو دەریا و هەروەها لەسەر داران هێلانە ساز دەکەن. زستانان زۆر هەیە. (31)

## تۆرەمەی کاسەڵەشینکە (39F)
Family CORACIIDAE

* ئەسپەشینە(؟)، بۆگەنە، حەوت ڕەنگیلە، خومەڕەژگە، خومەڕەژە، خومەڕشکە، خومەشینکە، سوورەکەوا، سەوزکۆ، قراکەسەوزە، قیژۆک، کاساڵەشینکە، کاسەڵکەشینکە، کاشەڵەشینکە، کاشەڵەشینە، گونجگیر.

ئەو باڵندانە وەک قەلەبەڵەکە دەچن. ڕەنگاوڕەنگن. دندووکیان قەوی و تا ڕادەیەک قەلانگییە. ملیان قوڵە و قاچیان بەهێزە. زۆر جار لە شوێنی بەرز



هەڵدەنیشن و جووڵە لە خۆیان دەبڕن. لە بەرزاییەوە بۆ گرتنی مێش و مەگەز، مارمێلکە و گیانلەبەرانی ورد هێرش دەبەن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. بەتەنیا دەژین. لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: کاسەڵەشینکە، کاسەڵەشینکەی هیندی.

کاسەڵەشینکە (284)

سبزقبا
Coracias garrulus
Rollier d’Europe
Roller

٣٠ سانتیمێترە. دندووکی بەهێزە. بەدەنی شینی ئاسمانییە و پشتی شێ ڕەنگ. باڵی شینە و لەکاتی فڕین دەوری ڕەش دەنوێنێ. کلکی شینی ئاماڵ کەسکە و پەڕی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. لەکونی کەنداڵ و دیوار و کونەداران هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (196)

کاسەڵەشینکە–ی هیندی (285)

سبزقبای هندی
Coracias benghalensis
Rollier de I’Inde
Indian Roller

٣٠ سانتیمێترە. سەری سەوزی ئامالّ شینە. لاجانگ و گەروو و سەر و سینگی قاوەیی کاڵە و ڕێ ڕێی سپی نادیاری تێدایە. پاش ملی قاوەیییە و سەوزاییشی تێدا بەدی دەکرێ. بەرزگی شینی کاڵە و خەتی سپی تێدایە. باڵ و کلکی شینی کاڵ و بنەوشی توندن. ئاکار و دەنگی لەهی کاسەڵەشینکە دەچێ. لە کونی داراندا هێلانە ساز دەکا. (196)

## تۆرەمەی کلک زەردە (40F)
Family BOMBYCILLIDAE

بریتین لە: کلک زەردە، میوەخۆرە.

کلک زەردە (286)

باڵ لاکی
Bombycilla garrulus
Jaseur boréal
Waxwing

* بازی کڵاودار

بەهاسانی لە ڕووی کاکۆڵی شێی ئاماڵ چێرەیی و کلکی کورت و سەر زەردی دەناسرێ. خەتی چاو و ملی ڕەشە. پشتی شێ ڕەنگە و داوێنی بۆرە. بەرزگی قاوەیی ئامال چێرەییە و ژێر ئاتەگی شێ ڕەنگە. باڵی ڕەشە و خەتی سپی و زەردی تێدایە. لەسەر باڵی پنۆکی سوور هەیە؛ لە مێیەدا کاڵ و نادیارە. بەباڕی ڕەشایی ملی نییە و بەرزگی ڕێ ڕێی کاڵە. فڕینی وەک سێروویە. زوو دەستەمۆ دەبێ. زستانان لە شوێنی ئاوەڵا دەبێ. لە دەوروبەری پەرژین و باغان لە میوەی وەک توو دەگەڕێ. (230)

میوەخۆرە (287)

میوەخور
Hypocolius ampelinus
Hypocolius gris
Grey Hypocolius

**٢٣** سانتیمێترە. نێر، بۆرە و لاجانگ و شاپەڕی باڵی ڕەشە. دندووکی باڵی سپییە. سەری کلکی ڕەشە. مێیە، قاوەییترە و ڕەشایی لاجانگی نییە. ئەو باڵندەیە وەک پەڕپەڵەکە دەچێ، بەپۆل دەگەڕێن. میوە دەخۆن. لە بیابان و ئەو شوێنانەی پنچک و دڕوو و گیای کورتەبنی لێیە دەژی. لەنێو باغی میوە و خورما دەبینرێ. لەسەر پنچک و دار و دارەخورما هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (231)

## تۆرەمەی کوڕکوڕە (41F)
Family PTEROCLIDIDAE

* ترەوەڕە (؟)، قتک، قەتێ، کوڕکوڕ، کەت، کەتێ، هاوارەبەرە.

باڵندەی تایبەتی ئیشکانین، وەک کۆتر دەچن. باڵ و کلک و دندووکیان درێژە؛ لاقیان قوڵە و تووکنە. لەناکاو بەتوندی لە عەرز بەرز دەبنەوە و دەفڕن. پێڕۆیان وەک کۆترە. لە بیابانی ئیشک و بەیاردا دەژین. زیاتر ڕەنگی پەڕ و باڵیان بۆرە. نێر و مێیان یەک ڕەنگ نین. بەگەل دەژین. بەڕۆژ لەکاتی دیاری کراودا ڕێگایەکی دوور بۆ خواردنەوەی ئاو دەبڕن. لەسەر عەرز هێلانە ساز



دەکەن. لە دانەوێڵە، گیاوگۆڵ و مێش و مەگەز چینە دەکەن. بریتین لە: کوڕکوڕەی بەرزگ خەنەیی، کوڕکوڕەی بەرزگ ڕەش، کوڕکوڕەی بەرزگ سپی، کوڕکوڕەی خاڵخاڵ، کوڕکوڕەی ڕێ ڕێ، کوڕکوڕەی کلک درێژ، کوڕکوڕەی گەنمان.

کوڕکوڕە–ی بەرزگ خەنەیی (288)

کوکر شکم بلوطی
Pterocles exustus
Ganga á ventre chatain
Chestnut-bellied Sandgrouse

**٣٢** سانتیمێترە. نێرە سەر و مل و سینگی زەردی کاڵە. خەتی ڕەشی بەسینگیدا هاتووە. بەرزگی خەنەیی ئامال ڕەشە. مێیە تەواو زەردی خاکییە؛ بێجگەلە بەرچێڵە و ملی هەموو گیانی خەت خەتی ڕەشی پێداهاتووە. نێرە و مێیە شاپەڕی کلکیان درێژە، شاباڵیان ئامال ڕەشە، سەری شاباڵیان سپییە. لە شوێنی ڕووتەن و ئیشک کە تاق تاق پنچکی لێ ڕواوە هێلانە ساز دەکا. (181)

کوڕکوڕە–ی بەرزگ ڕەش (289)

کوکر شکم سیاه
Pterocles orientalis
Ganga unibande
Black-bellied Sandgrouse

**٣٤** سانتیمێترە. نێرە سەری بۆری مەیلەو زەردە. پشتی بۆرە و خاڵخاڵی نارنجی تێدایە. شاباڵی نارنجییە. گەرووی خەنەیی ڕەنگە. خاڵێکی ڕەشی لە ملی دایە. سینگی بۆرە و خەتی ڕەشی پێداهاتووە. مێیە خاکییە، سینگ و سەر و پشتی پنۆک پنۆکە، گەرووی زەردی پنۆک پنۆکە و خەتی ڕەشی بەسینگیدا هاتووە. هەم مێیە و هەم نێرە بەرزگیان ڕەشە. لە بیابان دەژی. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (172)

کوڕکوڕە–ی بەرزگ سپی (290)

کوکر شکم سفید
Pterocles alchata
Ganga cata
Pin-tailed Sandgrous

**٣٧** سانتیمێترە. باڵی درێژ و نووک تیژن. بەرزگ و ژێر باڵی سپییە. نێرە پشتی

قاوەیی ئامـاڵ بۆرە کە پڕە لە خاڵی نارنجی، شابالّی شێ ڕەنگە، سەری مـەیلەو بۆرە، دەم و چاوی زەردی نارنجییە، چەنە و گەرووی ڕەشە، ملی زەردە، سینگی شێ ڕەنگە، دوو خـەتی ڕەش و ئەرغـەوانی پێـداهاتووە. مل و بەرزگی مـەیلەو سپـییـە، سـینگی مـەیلەو زەردە و دوو سێ خـەتی ڕەشی پێداکشاوە. نێرە و مێیە زستانان وێک دەچن. توند دەفڕن. بەگەل دەژین. لە بیابان و دەشت، لە شوێنی نەرمان و بەردەڵان هێلانە ساز دەکەن. (172)

کوڕکوڕە–ی خاڵخاڵ (291)

کوکر خالدار

Pterocles senegallus

Gange tacheté

Spotted Sandgrouse

**٣٣** سـانتـیـمـێـتـرە. نێـرە بەڕەنگی زەردی کاڵـە. چەنە، مل و گـەرووی تەواو زەردە. لە لاقـیـیـەوە بەرەو ئاتەگی ڕەشە. برۆی بۆرە. مـێـیـە پشت و سـینگی پڕە لە خاڵی ڕەش. نێـرە و مێـیـە هەردوو شاپەڕی کلکیـان درێژە. بەگەل دەژین. بەیـانان زۆر زوو دەچن بۆ ئاو خواردنەوە. لە بیـابان لە شوێنی بەردەڵان و خیـزکێن دەژین. لەسەر عـەرز، لە شوێنی ڕووتەن هێلانە ساز دەکا. (172)

کوڕکوڕە–ی ڕێ ڕێ (292)

کوکر راەراە

Pterocles lichtensteini

Ganga de Lichtenstein

Lichtenstein’s Sandgrouse

**٢٥** سانتیمێترە. نێرە نێوچاوانی سپییە. پەڕ و باڵی زەردە و خەت و خاڵی قاوەیی پڕ ڕەنگی تێدایە. بەرسینگی زەردی کاڵە و خەتی ڕەشی پێداکشاوە. بەرزگی خەت خەتە. مـێـیـە قـاوەیی ئامـاڵ بۆرە. تەواوی بەدەنی خـەت و خـاڵی تێـدایە. زۆرتر بەجـووت دەگـەڕێن. بەیانی زوو دەچتـە ئاو خـواردنەوە. لە بیـابانی ویشک دەژی. لەبن پنچکان هێلانە دەکا. (181)



کوڕکوڕە–ی کلک درێژ (293)

کوکر دم دراز

Syrrhaptes paradoxus

Syrrhapte paradoxal

Pallas’s Sandgrouse

**٣٥ هەتا ٤٠** سانتیمێترە. کلکی زۆر درێژە. نێرە سەر و گەرووی نارنجییە، لاجانگی بۆرە. پشـتی بۆرە و خـاڵی پانی ئامـاڵ ڕەشی تێـدایە، بەرزگی ڕەشە، کلکی لە مـێـیـە درێژترە. مێیە خەتی ڕەشی بەملدا کشاوە، سەری زەرد و بێ خاڵە؛ بەڵام بەدەنی هەموو خەت و خاڵی ئاماڵ ڕەشی پێداکشاوە. بەرزگی ڕەشە. (181)

کوڕکوڕەی–ی گەنمان (294)

کوکر گندمی

Pterocles coronatus

Ganga couronné

Coronated Sandgrouse

**٢٧** سانتیمێترە. نێرە سەری ئاماڵ شێیە و دەوری سەری بۆری ئاماڵ شینە. لاجانگی زەردە. خاڵی ڕەشی لە پێش چاو هەیە. پەڕ و باڵی قـاوەیی کاڵە. سـەری کلکی شـێی ئاماڵ ڕەشە. مێیە تەواو بۆری مەیلەو خورماییە؛ خەت و خاڵی قاوەیی هەیە، ملی خەت و خاڵی نییە. سەری شاباڵی نێرە و مێیە ئاماڵ ڕەشە. لەسەر عـەرز لەنێو بەردان هێلانە چێ دەکا. (181)

## **تۆرەمەی کوند** (42F)
Family STRIGIDAE

* بائەقـوش، بـادەقـوش، باوەقـوش، بایەقـوش، بـو، بوم، بوو، بووک(؟)، بووە، بووەتـەقلە، بـووەکـوێرە، بـووەکـەرە، خـالـەکـوکـومـە، فـشـفـشـە، کـوندەبوو، کوندەبوومە، کوندەبەبوو، کوندەبەبی، کەپوو (؟)، کەڵکەڵەوانی.

بەشـەو ڕاو دەکـەن. سـەریان زل و دەم و چاویان پانە؛ زەقـە. دندووکـیـان قـەڵانگـیـیـە. پەنجە و جنجڕووکی تیژ و بەهێزیان هەیە. لاقـیـان تووکنە. بێ هەست دەفڕن. بەتـەنیا دەژین. مێیەیان لە نێرە گەورەترە. لەکونی دیواری کۆنە خـانوو یان لەسـەر عـەرز هێـلانە سـاز دەکـەن. نێـچـیـری خـۆیان قـووت دەدەن. گیـانلەبەری وەک مشـک، بۆق، مـاسی، مێش و مەگەز، قـرژاڵ و... ڕاودەکەن. بریتـین لە: تاق تاق، تاق تـاقی بۆر، کـوندەپشـیلە، کـوندەڕۆمـاڵ، کـوندەزێڕە،

کوندەزێوە، کوندەسپی، کوندەشەخسە، کوندەشەخسەی خاڵخاڵ، کوندەقوتە، کوندەگایە.

تاق تاق (295)

**مرغ حق**
Otus scops
Hibou petit-duc
Scops Owl

* تاق تاق کەرە، تاقڵە(؟)، تاک تاک کەرە، توتاک(؟)، توتەک(؟)، حەق حەقۆک، هەق هەق کەرە، یاحەق.

**١٩** سانتیمێترە. قاوەیی ئاماڵ بۆرە، پەڕ و باڵی ڕێ ڕێیە. لەسەریدا دوو شاخی تووک بەئاستەم سەریان هەڵداوە. شەوانە مێش و مەگەز ڕاو دەکا. لە دارستانەکانی نیزیک دەوروبەری ئاواییبیان، باغ و باغچان، کۆنە خانوو و هێلانەی کۆنی باڵندان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (194)

تاق تاق-ی بۆر (296)

**مرغ حق جنوبی**
Otus brucei
Hibou petit-duc de Bruce
Striated Scops Owl

**٢١** سانتیمێترە. هەر لە تاق تاق دەچێ، بەڵام بۆرایی و ڕەنگی خورمایی کەمترە. خەت و خاڵی باریکترە. سپیایی پاش ملی نییە، کلکی کەمێک درێژترە. لە باغ و باغچان، کۆنە خانوو و هێلانەی کۆنی باڵندەکانی تردا هێلانە ساز دەکا. (193)

کوندەپشیلە (297)

**جغد گوش دراز**
Asio otus
Hibou moyen-duc
Long-eared Owl

**٣٥** سانتیمێترە. پشتی پڕە لە خاڵ و خەتی زەرد و قاوەیی ئاماڵ بۆر. بەرزگی کاڵە و خەت خەتە. پەڕی گوێی درێژە و وەک شاخ لەسەری بەرز بۆتەوە. برۆی سپییە. بەڕۆژ لەسەر داران دەژی. جڕ و جانەوەر و باڵندەی بچووک و گیانلەبەری وەک مشک دەخوا. لە کۆنە هێلانەندا هێلکە دەکا. جاری وایە لەسەر عەرزیش کورک دەبێ. (194)



کوندەڕۆماڵ (298)

**جغد ماهی خور**
Ketupa zeylonensis
Chouette pêcheuse brune
Brown Fish Owl

* ڕۆماڵ

**٥٣** سانتیمێترە. بەپێچەوانەی کوندەگایە شاخی قیت نییە و شۆڕە. پەڕ و باڵی شڵەیە و لەڕەنگی قاوەییییە و ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە. پشتی خەت و خاڵی ئاماڵ زەردی تێدایە. گەرووی سپییە. لاقی زەرد و ڕووتە. هەمیشە لە نزیک ئاو، لە کەنار دەریا و لێڕەوار و ڕووباران دەبینرێ. لەنێو بەرد و کونی دار و هێلانەی کۆنی باڵدارە ڕاوکەرە گەورەکاندا هێلانە ساز دەکا. (193)

کوندەزێڕە (299)

**جغد طلائی**
Strix butleri
Chouette de Butler
Hume’s Tawny Owl

**٢٩** هەتا **٣٢** سانتیمێترە. پشتی قاوەیی ئاماڵ نارنجییە. سەر و ملی تەڵاییە، سەری پڕ ڕەنگە. کلکی زەردی توندە و شەش خەتی بۆری پێداکشاوە. بەرزگی سپییە و زەردایییشی هەیە. زۆر کەم هەیە. (193)

کوندەزێوە (300)
Strix aluco
Chouette hulotte
Tawny Owl

**٣٧** سانتیمێترە. پەڕ و باڵی پڕ لە خەت و خاڵە. سەری گەورە و خڕە، چاوی ڕەشە. پەڕی گوێی نییە. پشتی قاوەیی ئاماڵ زەردە. دەم و چاوی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. شەوانە دەکەوێتە جم و جۆڵ. لە لێڕەواری پڕ و چڕ، پارک و باغی گەورە دەبینرێ. لە کونی داران، کۆنە هێلانەی باڵندان و تەنانەت جاری وایە لە خانووان و لانی کەروێشکاندا هێلانە ساز دەکا. زۆر هەیە. (194)

کوندەسپی (301)

**جغد سفید**
Tyto alba
Chouette effraie
Barn Owl

٣٤ سانتیمێتره. لاقی درێژه. دوو جۆری سپی و بۆری هەیە. دەم و چاوی سپییە و پشتی زەردی ئاماڵ تەلاییە و خاڵی وردی تێدایە، بەرزگی تەواو سپییە. چاوی ڕەشە. شاخی تووکی نییە. زیاتر شەوگەردە، بەڵام جارجار بەڕۆژیش ڕاو دەکا. قیت هەڵدەنیشێ. زۆرتر مشک و لەچەشنی ئەو ڕاو دەکا. لە خانووی کۆنە و کەلاوە و بورجاندا هێلانە ساز دەکا. (194)

کوندەشەخسە (302)

**جغد کوچک**
Athene noctua
Chouette checêche
Little Owl

* کوندە سەرپان

٢١ سانتیمێتره. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە و خەت و خاڵی سپی تێدایە بەرزگی سپییە و خەتی پانە. چاوی زەردە. زیاتر بەڕۆژ دەگەڕێ. لەسەر دارتێل و چەپەران قیت هەڵدەنیشێ هەر کە هەست بەمەترسی بکا پەیتا پەیتا سەری دەجوولێنێتەوە. مێروولە و جڕ و جانەوەر و مشک و باڵندەی بچووک ڕاو دەکا. لە زەویوزاران، جێی بەیار و بەردەڵان دەبینرێ. لە کونەدار و کونەبەرد و هەروەها کونی دیواراندا هێلانە دەکا. (194)

کوندەشەخسە-ی خاڵخاڵ (303)

**جغد کوچک خالدار**
Athene brama
Chouette brahmane
Spotted Little Owl

٢٠ سانتیمێتره. بەتەرز وەک کوندەشەخسە دەچێ، بەڵام ڕێ ڕێ نییە و خەتی پانی قاوەیی و سپی تێدایە (کوندەشەخسە زنجیرییە). هەروەها سەری خاڵخاڵی سپییە. چەنە، گەروو و لاجانگی سپییە. خەتی قاوەیی بەگەروویدا کشاوە. پاش ملی خەتی سپی تێدایە. شوێنی ژیانی وەک کوندە شەخسەیە. (193)



کوندە قوتە (304)

**جغد تالابی**
Asio flammeus
Hibou des marais
Short-eared Owl

٣٧ سانتیمێتره. زەردی ئاماڵ قاوەیی کاڵە. بەرزگی ڕێ ڕێیە. باڵی درێژە و خەتی باڵانی بە بەرینایییاندا کشاوە. ژێر باڵی خاڵی ئاماڵ ڕەشی تێدایە و لەکاتی فڕیندا دیار دەکا. ئەو کوندە لەسەر عەرز هەڵدەنیشێ. سینگی بەرەو پێش ڕادەگرێ. لەشام و زۆنگ و زەلی بەرفرەوان و تەپۆڵکەی خیزکێن و شوێنی زەنوێر دەبینرێ. (194)

کوندەگایە (305)

شاەبوف
Bubo bubo
Hibou grand-duc
Eagle Owl

* بم، شابوو، شاپوو

٦٦ هەتا ٧٠ سانتیمێتره. گەورەترین تۆرەمەی کوندە. دوو دەستە تووک وەک شاخ لەسەریدا ڕواوە. سینگی زەردی مەیلەو قاوەییە و خەت خەتی پانی پێداکشاوە. چاوی گەورە و زەردە، پشتی زەردی ئاماڵ قاوەییە؛ خاڵەکانی قاوەیی پڕ ڕەنگن. دەتوانێ گیانلەبەرانی گەورەی وەک کەروێشکیش ڕاو بکا. بەیان و ئێواران ڕاو دەکا. لە قەڵشتی بەرد و کونی داراندا وچان دەدا. بەتەنیا دەژی. لە لێڕوار، ڕەوەز، دەشت، ناو پنچک، قەڵشتی دار و هێلانەی کۆنی «باز»دا هێلانە دەکا، زۆر هەیە. (193)

## تۆرەمەی کۆتر (43F)
Family COLUMBIDAE

بەهییف (؟)، کابۆک، کاوتر، کاوەتر، کۆتریک، کەبۆتەر، کەبووتک، کەفتەر، کەڤوک، کەڤۆک، کەمووتەر، کەمۆتەر، کەواتر، کەواتری، کەوتەر، گۆتر.

ئەم باڵندانە باڵ و کلکیان تا ڕادەیەک درێژە، سەریان چووک و ملیان قوڵەیە. لەسەر هەرد، لەسەر دار دەبینرێن. کاتی کورک بوون بەگەل دەبینرێن. تیژ باڵن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگن. لەسەر دار یان لە کونەبەرداندا هێلانە ساز دەکەن. دانەوێڵە خۆرن؛ هێندێک جۆریان مێش و مەگەز و کرم و شەیتانۆکەش

دەخۆن. بریتین لە: قومری، قومری ڕۆژهەڵاتی، کۆترەباریکە، کۆترەشینە، کۆترەگایە، کۆترەنەخشینە، کۆترەنەخشینەی ڕۆژهەڵاتی، یاکەریم.

قومری (306)

قمری خانگی
Streptopelia senegalensis
Tourterelle maillée
Palm Dove

٢٦ سانتیمێترە. سەر و ملی شەڕابی کاڵە. خاڵی سەر ملی کونجی کونجییە. بەرچێڵەی کاڵە. بەرزگی ئاماڵ سپییە. پشتی خورماییە و ئاتەگی بۆریلەیە. شاباڵی شینی کاڵە و کاتی فڕین دیار دەکەوێ. ئاڵقەی دەوری چاو و لاقی سوورە. نێرە و مێیە لەیەک دەکەن. بەباری ڕەنگی بۆرترە. لە شار و گوندان دەبینرێ. لەسەر دار و خانووان هێلانە ساز دەکا. (183)

قومری-ی ڕۆژهەڵاتی (307)

قمری خاوری
Streptopelia orientalis
Tourterelle orientale
Rufous Turtle Dove

٣١ سانتیمێترە. وەک کۆترەباریکە دەچێ. باڵی خەنەیی پنۆک پنۆکە. شاقەلی ئاماڵ شینە. لاقی سوورە. سەری خورمایی کاڵە. پاشەستۆی خاڵی تێدایە. لە شوێنی شەدار دەبینرێ. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. (183)

کۆترەباریکە (308)

قمری معمولی
Streptopelia tutur
Tourterelle des bois
Turtle Dove

* کۆترەبەرجیلە (؟)، کۆرک (؟)، کۆڤۆ (؟)، کەڤۆکرک (؟).

٢٧ سانتیمێترە. بەدەنی باریکە، کلکی نەختێک درێژ و مەیلەو ڕەشە پشتی شێ ڕەنگە و پەڕی ڕەشی تێدایە، تووکی ملی ڕەش بەڵەکە. گەروو و ملی شەڕابییە. بەباری خاڵی دەوری گەردن و ئەو ڕەنگە شەڕابییەی نییە. لە ڕووتەنان، لەسەر پەرژین و دارستانی چڕدا دەبینرێ. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (183)



کۆترەشینە (309)

کبوتر چاهی
Columba livia
Pigeon biset
Rock Dove

* کۆترەچایی، کۆترەسەیدە، کۆترەشاخە، کۆترەشاخی، کۆترەکێفی، کۆترەکێوی، کۆترەشینکە.

٣٢ سانتیمێترە. ئاتەگی سپییە. بەدەنی شین بۆرە. خەتی ڕەش و سپی بەدرێژایی باڵانیدا هاتووە. سەری کلکی ڕەشە. لاقی سوورە. لاجانگی سەوزی بنەوشییە. زۆرتر لە ڕەوەز و ئەو گرە بەردانەی بەرووکاری دەریادا هەڵکەوتوون دەبینرێ. لە ئەشکەوت و کونەبەرداندا هێلانە ساز دەکا. ئەم کۆترە باوکە گەورەی کۆتری ماڵانە. (182)

کۆترەگایە (310)

کبوتر جنگلی
Columba palumbus
Pigeon ramier
Wood pigeon

* ئوورکووتک (؟)، پەڵخی، چەلەکوری (؟)، کۆترە باڵ بازوو (؟)، کۆترە پەڵخی، کۆترەگایانە، گاپل (؟)، گاکۆتر، گاکەمووتەر، گایە (؟)، کۆترەگایانە، هێلەوەی (؟).

٤٠ سانتیمێترە. گەردنی شەڕابییە. هەر لاملەی خاڵێکی سپی لێیە؛ دەورەیان کەسک و ئەرغەوانییە. کاتی فڕین خەتی سپی باڵی وەدیار دەکەوێ. بەباری نیشانەکانی سەر گەردنی نییە. ئەو باڵندانە بەپۆل دەگەڕێن. لە هەموو شوێنێ تەنانەت لەشارەکانیشدا دەبینرێ. لەسەر دار، پەرژین و تەنانەت هێلانەی بەتاڵی باڵندەکانی تر هێلانە چێ دەکا. (182)

کۆترەنەخشینە (311)

فاختە
Columba oenas
Pigeon colombin
Stock Dove

* کوکوختی، گوگوختی

٣٢ سانتیمێترە. پشتی بۆری مەیلەو شینە، لاجانگی ئاماڵ کەسکە، سەری کلک و

شاباڵی مەیلەو ڕەشە. لاملی سەوزە؛ بەڵام بەباڕی ئەو سەوزاییيەی نییە. ئەم باڵندەیە لەسەر داری بڵیند و پڕ لک و پۆ و ڕەوەزە بەردی کەنار دەریا دەبینرێ. لە کونی داران، قەڵشتە بەردان، کونی سەر عەرز و خانووبەرەی بڵیندا هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (182)

کۆترەنەخشینە-ی ڕۆژهەڵاتی (312)

فاختە خاوری
Columba eversmanni
Pigeon d'Eversmann
Eastern Stock Dove

**۲۹** سانتیمێترە. زۆر لە کۆترە نەخشینە دەچێ. ڕەنگی سەری ئاماڵ شەڕابییە. لاملی سەوزە. خەتی کلکی کاڵە. دەنگی وەک کۆترەنەخشینە دەچێ. لەو شوێنانەی کە تاق تاق داری هەیە هەروەها لە لێژایی گڕە بەردی چیاکان دەژی. لە کونەدار و کونەبەرداندا هێلانە ساز دەکا. (183)

یاکەریم (313)

یاکریم
Steptopelia decaocto
Tourterelle turque
Collared Dove

* فاتک (؟)

**۲۷** سانتیمێترە. کلکی لە کۆترەباریکە درێژترە. پشتی قاوەیی کاڵە. پاشەستۆی خەتی پێداکشاوە. مل و بەرزگی کاڵە. دەم و چاوی شەڕابی کاڵە. چاوی سوورە. لەشار و گوندان دەبینرێ. لەسەر دار و خانووان هێلانە ساز دەکا. (183)

## **تۆرەمەی کۆترەپەپوو** (44F)
Family CUCULIDAE

* کوکوکنەک

ئەو باڵندانە زۆرتر لەسەر دار دەژین. قاپۆڕیان باریک و کلکیان درێژە. دندووکی ئەستوور و قەڵانگیان هەیە. بەپێچەوانەی باڵندەکانی تر دوو قامکیان لە پێشەوە و دووشیان لە دواوەیە. بەتەنیا دەژین. لە هێلانەی سەر داری باڵندەکانی تردا هێلکە دەکەن. نێرە و مێیەیان وێک دەچن. مێش و



مەگەز و شەیتانۆکە و کرم و میوە دەخۆن. بریتین لە: کۆترەپەپوو، کۆترەپەپووی جغەڕەش، کۆترەپەپووی خاڵخاڵ.

کۆترەپەپوو (314)

کوکو
Cuculus canorus
Cucou gris
Cuckoo

**۳۲** سانتیمێترە. کلکی درێژە، نووکی باڵی تیژە. پشت و ملی بۆری مەیلەو شینە و بەرزگی سپی ڕێ ڕێیە. کلکی بۆرە و خاڵی سپی تێدایە؛ هەروەها سەری کلکی خڕە. لاقی زەردە. بەباڕی پەڕ و باڵی سوورگوێزە و خاڵی سپی لە لاملە و بەرزگی سپی واشە. هێندێک لە مێیەکانیش جاری وایە خورمایی ڕەنگن. لە قەراغ لێڕەوار، شوێنی پڕ پنجک و تەنانەت لە شوێنی بێ داریش دەبینرێ. چەند نێرە لە دەوری مێیەیەک دەهاڵێن. لە کۆنە هێلانەی باڵندەکانی تردا تەنیا هێلکەیەک دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (184)

کۆترەپەپوو-ی جغە ڕەش (315)

کوکوی تاجدار
Clamator jacobinus
Coucou jacobin
Pied Crested Cuckoo

**۳۲** سانتیمێترە. سەر و پشتی ڕەشە. کاکۆڵی قرژنی ڕەشە و جاری وایە سەوز دەنوێنێ، بەرزگی سپییە. باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە و خەتی پانی سپی پێداهاتووە و لە فڕیندا جوان دیارە. بەگەل لەسەر دارێکەوە بۆ دارێکی دیکە هەڵدەفڕن. قاژ و قوڕیان زۆرە. بۆ چینە کردن دێنە سەر عەرز. لە لێڕواری پڕ و چڕ و مێشەڵانێدا ڕایدەبوێرن. لە هێلانەی باڵندەکانی تردا هێلانە چێ دەکا. (184)

کۆترەپەپوو-ی خاڵخاڵ (316)

کوکوی خالدار
Clamator glandarius
Coucou-geai
Great Spotted Cuckoo

**۳۹** سانتیمێترە. کاکۆڵی هەیە. کلکی درێژ و گەوەڕی کلکی سپییە. پشتی قاوەیی

پنۆک پنۆکی سپییە. بەرزگی سپی واشە و ملی زەردە. ئاڵقەی دەوری چاوی نارنجییە. بەبارِی سەری رِەشە و کاکۆڵی نییە و شاباڵی شێ رِەنگە. ئەو باڵندەیە لەکاتی کورک بووندا پرِ قاژ و قووژە. زۆرتر لەسەر پەرژینان دەنیشێ. ئاکاری لەهی قشقەڵە دەکا. لە هێلانەی باڵدارانی تردا هێلانە دەکا. (184)

## تۆرەمەی کۆتری دەریایی (45F)
Family PROCELLARIIDAE

کۆتر–ی بچووکی دەریایی (317)
کبوتر دریایی کوچک
Puffinus assimilis
Petit Puffin
Little Shearwater

**٢٨** سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک رِەنگە. پشتی رِەشە. بەرزگی سپییە. تووکی بن باڵ و ئاتەگی قاوەییە. دندووکی باریکە. لەدەستەی بڵاودا لە سەر دەریا دەبینرێن. توندفرِە. زۆرتر مەلە دەکا. لە کونە بەردی دورِگەکانی قەراغ دەریا هێلانە ساز دەکا. (30)

## تۆرەمەی کەڵک (46F)
Family PELECANIDAE

* چەڵک، سەقا، سەقاقوش، سەقاو، قوتان، کەراڤی، کەراوی

لە باڵندە هەرە گەورەکانن، پێ بەپەردەن. گۆشتیان ناخۆن. بەرلۆغەیان هەیە و لەناو ئاوی قووڵ و چۆماواندا زار دەکەنەوە هەتا ماسی و گیانلەبەری تری ناو ئاو بچنە زاریانەوە. لەم بەرلۆغەیە بۆ دەفە هەروەها لە ئێسکی باڵیان بۆ تووزەلە کەڵک وەردەگیرێ. ئەم باڵندانە درەنگ باڵ دەگرن و بۆ فرِین مەودایەک لەسەر لاقان رِا دەکەن. دوو جۆری رِەنگ بۆر و رِەنگ سپییان هەیە.



کەڵک (318)
پلیکان سفید
Pelecanus onocrotalus
Pélican blanc
White pelican

* کەڵکەسپی

**١٤٠ هەتا ١٧٥** سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک رِەنگە. سپییە، سەری شاباڵی رِەشە. بەرلۆغەی وەک کیسەیەکی گەورە بەبنی دندووکی درێژ و مەیلەو زەردیەوە هەڵاوەسراوە. بەبێچوویی قاوەییە. بەرزەفرِە. هاوینان زۆر هەیە. لەناو زەل و گۆلاواندا دەژی و لەناو قامیشەڵاندا هێلانە ساز دەکا. بەخواردنی گیانلەبەرانی ناو ئاو بەرِێ دەچێ. (31)

کەڵک–ی بۆر (319)
پلیکان پا خاکستری
Pelecanus crispus
Pélican frisé
Dalmatian pelican

**١٦٠ هەتا ١٨٠** سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک رِەنگە. لە حەوای لەگەڵ کەڵکی سپی لێک ناکرێتەوە. چاوی مەیلەو زەردن. سەری شاباڵەکانی قاوەیین. رِەنگی سپی تولْخە و بەرسینگی کەمێکی زەردە. پاش ئەستۆی کەمێک قرژنە. ئەمەشیان وەک کەڵکی سپی دەژی. زستانان زۆر هەیە. (31)

## تۆرەمەی کەندەسمە (47F)
Family MEROPIDAE

* رِەنگاڵە (؟)، رِەنگ رِەژە، رِەنگ رِێژە قاژقاژ (؟)، کەناوەسمە، کەنەسمە، مێش خۆرکە، مێش خۆرە، واوەخۆرە، هەنگ خورە، هەنگ چنە، هەنگە چینە، هەنگەخۆرکە، هەنگەخۆرە، هەنگەژاڵەخۆرە.

ئەو باڵندانە بەپۆل دەگەرِێن. باریکەڵەن باڵیان درێژ و نووک تیژە و کلکیان درێژە. دندووکیان باریک و تا رِادەیەک خوارە. نێرە و مێیەیان یەک جۆرن. لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن. لە هەوا مێش و مەگەز رِاو دەکەن، زۆرتر زەرگەتە و هەنگ دەخۆن. بریتین لە: کەندەسمە، کەندەسمەی بچووک، کەندەسمەی بەرچێڵەسوور.

کەندەسمە (320)

زنبورخور معمولی
Merops apiaster
Guêpier d’Europe
Bee-eater

٢٧ سانتیمێترە. باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە. دندووکی درێژ و خوارە. دوو شاپەڕی کلکی لەوانی تری درێژترن. پشتی شێی ئاماڵ زەردە. کلک و بەرزگ و شابالّی کەسکی ئامالّ شینە و گەرووی زەردە. بەبارِی دوو شاپەڕی درێژی کلکی نییە. بەپۆل دەگەڕێن. لە شوێنی بەرز هەڵدەنیشن. لەکوندا هێلانە دەکا. جاری وایە لەسەر عەرز بەگەل هێلانە دەکەن. (196)

کەندسمە-ی بچووک (321)

زنبورخور کوچک
Merops orientalis
Guêpier d’Orient
Little Green Bee-eater

٢٥ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی سەوزە. دەوری چاوی ڕەشە.خەتی ڕەشی بەسینگدا کشاوە و گەرووی شینە. سەری جارجار ئامالّ نارنجی دەبێ. ژێر باڵی سوورێکی زۆر کالّە. بەجووت دەگەڕێن. لەسەر دار و زەوی و مێشەی گەزان دەبینرێ. (196)

کەندەسمە-ی بەرچێلّە سوور (322)

زنبورخور گلو خرمایی
Merops superciliosus
Guêpier de perse
Blue-cheeked Bee-eater

٣٠ سانتیمێترە. پشت، بەرسینگ و زگی سەوزە. لاجانگی شینی کالّە. ژێر باڵی ڕەنگ خورماییە، یەک دوو شاپەڕی کلکی درێژترە. ئاکاری وەک کەندەسمە دەچێ. لە دەشت و کەشاو و مردوواو دەبینرێ. بەگەل لە کونی کەنداڵی چۆم و تەپۆڵکان هێلانە ساز دەکا. (196)

## **تۆرەمەی گۆرەویچنە** (48F)
Family PARIDAE

* دوکەریسە، دوکەرێسە، گۆرواباف، گۆرەویلە، گۆرێچنە.

ئەو باڵندانە لەسەر داران دەژین. زۆر دەهات و چۆدان. دندووک و لاقیان کورت و



بەهێزە. بۆ فڕین کەم تاقەتن. زستانان بەگەل دەژین. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لە کونان، سەر داران و نێو پنچکان هێلانە ساز دەکەن. مێش و مەگەز و کرم و جارجار دانەوێڵەش دەخۆن. بریتین لە: گۆرەویچنەی بۆر، گۆرەویچنەی پاش مل سپی، گۆرەویچنەی شێ، گۆرەویچنەی تورکستانی، گۆرەویچنەی سمێڵدار، گۆرەویچنەی شین، گۆرەویچنەی کلک درێژ، گۆرەویچنەی گەورە.

گۆرەویچنە-ی بۆر (323)

چرخ ریسک سر سیاه
Parus lugubris
Mésange lugubre
Sombre Tit

١٤ سانتیمێترە. دندووکی لە گۆرەویچنەکانی دیکە ئەستوورترە. سەر و بەرچێلّەی ڕەشی ئامالّ قاوەیییە. پشتی قاوەیی ئامالّ بۆرە. دەم و چاو و لاملی سپییە. بەرزگی سپی واشی تولّخە و لاتەنیشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. کردەوەی وەک گۆرەویچنەی گەورە دەچێ، بەڵام زستانان کەم وا هەیە. بچێتە ناو باڵندەکانی تر. لە دەشتی نزم و داوێنی کێوی پڕ دار و ڕەوەزی ڕووت دەژی. لە کونی دار و بەردان هێلانە ساز دەکا. (315)

گۆرەویچنە-ی پاش مل سپی (324)

چرخ ریسک پس سر سفید
Parus ater
Mésange noire
Coal Tit

١١ سانتیمێترە. نەختێک لە گۆرەویچنەی شین چووکترە. سەری تەواو ڕەشە و پاش مل و لاجانگی سپییە. بەرچێلّەی ڕەشە. پشتی زەیتوونی مەیلەو بۆرە و دوو خەتی سپی بەباڵیدا کشاوە. بەرزگی و پاش ملی زەردە. لە لێڕەوار و باغاندا دەژی. لە کوی دار و کەندەلانی چۆم و تەنانەت سەر عەرزیش هێلانە ساز دەکا. (315)

گۆرەویچنە-ی پشت شێ (325)

چرخ ریسک پشت بلوطی
Remiz pendulinus
Rémiz penduline
Penduline Tit

١٠,٥ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. ڕەنگی بۆر و قاوەیییە. کلکی درێژە.

سەر و ملی سپی مەیلەو بۆرە. خەتی پانی ڕەشی بەلاچاویدا هاتووە. پشتی سوورباوە و بەرزگی سپی زەردەواشە. لەگوڵ، زۆنگ، مێشە و قەراغ چەمان دەژی. هێلانەی هێلکەیی هەڵدەخا بە لکی دار و قامیشەوە هەڵیدەواسێ. (315)

گۆرەویچنە-ی تورکستانی (326)
چرخ ریسک تورانی
Parus bokharensis
Mésange du Turkestan
Turkestan Tit

١٥ سانتیمێترە. زۆر گۆرەویچنەی گەورە دەچێ، بەڵام کاڵترە. لە پەڕ و باڵی ڕەنگی زەرد و سەوز نابینرێ. لاجانگ و پاش مل و بەرزگی سپییە. سەر و بەرچێلە و سینگی ڕەشە. لەنێو باغ و پەرژیناندا دەژی. لە کونی دار و دیواراندا هێلانە ساز دەکا. (315)

گۆرەویچنە-ی سمێڵدار (327)
چرخ ریسک نیزار
Panurus biarmicus
Mésange á moustaches
Bearded Tit

١٦ سانتیمێترە. پشت و کلکی بۆرە، بەرزگی زەردی خۆڵێنەیە. نێرە سەری بۆرە و سمێڵی ڕەشە و هەروەها تووکی ژێر ئاتەگیشی ڕەشە. مێیە کاڵترە. سەری بۆرە. سمێڵی نییە، بەباری پشت و باڵ و دەوری کلکی ڕەنگی توندترە. ئەو باڵندەیە لە کاتێکا کلکی شل و شۆڕ ڕادەگرێ بەتوندی بەنێو قامیشاندا دەفڕێ. لەنێو قامیشەلانی پڕ دووڕە دەست دەژی خۆی هێلانەی خۆی لە نزیک عەرز لەسەر قامیشی شەدار ساز دەکا. (314)

گۆرەویچنە-ی شین (328)
چرخ ریسک سر آبی
Parus caerulus
Mésange bleue
Blue Tit

١١ سانتیمێترە. تەنیا گۆرەویچنەیەکە سەر و باڵ و کلکی شینی کاڵە. بەرزگی زەرد و لاجانگی سپییە. خەتی ڕەشی بەپاش مل و مل و چاویدا کشاوە؛ ئەو خەتانە پەیوەستن. پاش ملی قەیتانی سپی تێدایە. پشتی ئاماڵ کەسکە. بەباری پشتی



قاوەیی ئاماڵ کەسکە و لاجانگی زەردە. کردەوە و شوێنی ژیانی وەک گۆرەویچنەی گەورە دەچێ. (315)

گۆرەویچنە-ی کلک درێژ (329)
چرخ ریسک دم دراز
Aegithalos caudatus
Mésange á longue queue
Long-tailed Tit

١٣ سانتیمێترە. ٧ سانتیمێتر کلکییەتی، نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. پەڕ و باڵی تێکەڵاو لە ڕەنگی ڕەش و سپی و چێرەییە. دەنگی تایبەتی هەیە؛ پێی دەناسرێتەوە. سەری سپییە و چاوی کەوتوونە نێو هێڵێکی ڕەش. پشتی کونجی کونجی ڕەش و چێرەییە. بەرزگی سپییە. باڵ و کلکی ڕەشە. شاپەڕی دەوری کلکی سپییە. بەباری ڕەنگی بەدەنی توندتر و زەردایی تێدا نابینرێ. دائیمە دێ و دەچێ و حەجمینی نییە. لەنێو مێشەلانی پڕ پنچک و پەرژینان دەژی. هێلانەی هێلکەیی شکڵی خۆی لەسەر پنچکی دڕکاوی و دار ساز دەکا. (315)

گۆرەویچنە-ی گەورە (330)
چرخ ریسک بزرگ
Parus major
Mésange charbonniére
Great Tit

١٤ سانتیمێترە. لە هەموو گۆرەویچنەکان گەورەترە. سەر و ملی ڕەشی ئاماڵ شینی توندە. لاجانگی سپییە. بەرزگ و سینگی زەردە و خەتی ڕەشی پانی بەدرێژاییدا کشاوە. پشتی ئاماڵ کەسکە. بەباری سەری قاوەییە و لاجانگی زەرد. لەسەر دار دەژی. لەنێو لێڕەوار و باغ و پەرژینان دەبێ. لە کونی دار و دیواراندا هێلانە ساز دەکا. (315)

## تۆرەمەی لغاوەگورگە (49F)

Family GLAREOLIDAE

زۆرتری باڵندەکانی ئەم تۆرەمەیە. بەپۆل دەگەڕێن. کەمێک لە پەڕەسلێرکە دەکەن. خواردنیان زۆرتر مێش و مەگەزە. شێوەی ژیانی ودودە لەگەڵ ئەوانیتر کەمێک تۆفیری هەیە. بریتین لە: لغاوەگورگە، لغاوە گورگەی باڵ ڕەش، ودودە.

لغاوەگورگە (331)

گلاریول بال سرخ
Glareola pratincola
Glaréole á collier
Pratincole

**٢٥** سانتیمێتره. نێره و مێیەی یەک ڕەنگە. باڵی درێژ و تیژ و بۆره. کلکی ڕەش و دوو لکە. ئاتەگی سپییە. لاقی ڕەشە. دندووکی قوڵەیە. پشتی زەردگوێزە. بەرزگی بۆره. خەتی ڕەشی بەبەرچێڵەیدا هاتووە. بەپۆل دەگەڕێن و زۆر پڕ قاژ و قووژن. بەیانان و ئێواران مێش و مەگەز ڕاو دەکەن. هاوینان زۆر هەیە. لە قەراغ گۆل و شۆرەکات و ڕووتەن و ئاوگران دەبینرێ. (157)

لغاوەگورگە-ی باڵ ڕەش (332)

گلاریول بال سیاه
Glareola nordmanni
Glaréole á ailes noires
Black-winged pratincole

**٢٥** سانتیمێتره. نێره و مێیەی یەک ڕەنگە. ژێر باڵی ڕەشە و کاتی فڕین ئەم ڕەشییە دیار دەکا. پشتی بۆره. بەیانان و ئێواران بەپۆل دەگەڕێن. مێش و مەگەز ڕاو دەکا. کاتی هەڵنیشتن لەسەر عەرز باڵان فش دەکا. لەڕووتەنان، قەراغ ئاوگر و گۆلاوان، لە نیزیک ئاودا دەبینرێن. هاوینان زۆر هەیە. کلکی دوو لکە. (157)

ودودە (333)

دودوک
Cursorius cursor
Courvite isabelle
Cream-coloured Courser

**٢٢** سانتیمێتره. نێره و مێیەی یەک ڕەنگە. باڵندەیەکی لەڕ و لاوازە. پەڕ و باڵی ئاماڵ بۆره، دندووکی تیژ و خواره. سەری باڵ و تەواوی ژێر باڵی ڕەشە. دوو خەتی ڕەش و سپی بەچەشنی برۆ بەسەریدا ڕاکشاوە. ئەم باڵندەیە زۆرتر وەک ڕەوڕەوە دەچێ؛ لە پێرۆدا خێرایە. خۆ کۆم دەکا، بۆ ئەوەی نەبینرێ جووڵە لە خۆ دەبڕێ. لاقی درێژ و ئامالّ سپییە. کلکی کورت و خڕە. لە بیابانی خیزکێن و کەم گیادا دەژی. (147)



**تۆرەمەی لەگ لەگ** (50F)
Family CICONIIDAE

⁎ ئەلەرگ (؟)، حاجی لەق لەق، حاجی لەگ لەگ، حاجیلە، لک لک، لەق لەق.

ئەو باڵندانە نێره و مێیەیان یەک ڕەنگن، گەورەن، لاق و مل و دندووکیان درێژە. لەکاتی پێڕۆ زۆر بەهێدی و هێمنی هەنگاو هەڵدێننەوە. لەسەر دار، ڕەوەز، خانووبەرەی بڵیند یان هەر شوێنێکی بەرزی کەدەستیان بکەوێ هێلانە ساز دەکەن. زۆرتر بە ماسی، مار، بۆق، مێش و مەگەز و کەلاکی گیانلەبەران دەژین. کۆچەرین، گەرمێن و کوێستان دەکەن. دوو جۆری سپی و ڕەشی هەیە، بەڕەشیان دەڵێن حللێر.

لەگ لەگ (334)

لک لک سفید
Ciconia ciconia
Cigogne blanche
White Stork

**١٠٠** سانتیمێتره. ڕەش بەڵەکە، ملی درێژە، لاقی سووره. لە شوێنی بڵیند هێلانە ساز دەکا. لە قەراغ ئاوان، لەناو مەزرا و چیمەن و گۆلاواندا گیانلەبەری چووکە دەخوا. کۆچەرییە، گەرمێن و کوێستان دەکا. زوو ئۆگری ئاوەدانی دەبێ. (50)

حللێر (335)

لک لک سیاه
Ciconia nigra
Cigogne noire
Black Stork

⁎ لەگ لەگی ڕەش

**٩٥** سانتیمێتره. پەڕ و باڵی ڕەشە، بەرزگی سپییە، دندووک و لاق و دەورەی چاوی سوورن. زۆرتر تەنیایە و درەنگ ئۆگری ئاوەدانی دەبێ. باڵندەیەکی کۆچەرە. زۆرتر شوێنی پڕ دار و درەخت هەڵدەبژێرێ و لە گەوەڕی گۆل و چەم و زەل و دارستانەکانی نیزیک ئەو شوێنانە دەبینرێ. زیاتر لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆره. (50)

## تۆرەمەی لیکوو (51F)
Family TIMALIIDAE

ئەم تۆرەمەیە کلکیان درێژ و پەڕ و باڵیان قاوەیی ڕێ ڕێیە. لاق و پەنجەیان بەهێزە. دندووکیان بەقەوەت و خوارە. لەدەستەی کەم کەمدا دەبینرێن. هەمیشە لەنێو دار و پنچکان دێن و دەچن. لەلاق سەر عەرز قوندە قوندەی دەکەن. جوان نافڕن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. جڕ و جانەوەر دەخۆن. بریتین لە: لیکوو، لیکووی زەلان.

لیکوو (336)

لیکو
Turdoides caudatus
Cratérope de I’Inda
Common Babbler

**٢٢** سانتیمێترە. ڕەنگی سوورگوێزە. کلکی درێژە. پشتی سوورگوێزی بۆریلەیە و پڕە لە دێغ. بەرزگی کاڵترە و قەیتانی کاڵ بەلاسینگی داکشاوە. باڵندەیەکی بزۆز و پڕ قاژ و قووڕە. دایمە لەسەر عەرز لەهاتوچۆ دایە و چینە دەکا. بەپۆل دەبینرێ. لە شوێنی ئاوەڵا لەناو پنچک و داران دەبینرێ، لەسەر پنچکی دڕکاوی و دار هێلانە ساز دەکا. (314)

لیکوو-ی زەلان (337)

لیکوی تالابی
Turdoides altirostris
Cratérope d’Irak
Iraq Babbler

**٢١** سانتیمێترە. زۆر وەک لیکوو دەچێ. بەڵام بچووکترە و کزتر دێتە بەرچاو. پەڕ و باڵی کاڵترە و قاوەیی ئاماڵ نارنجییە. سەر و پشتی ڕێ ڕێی کەمتری هەیە. سینگی ڕێ ڕێ نییە. دندووکی قوڵەتر و ئەستوورترە. کردەوەی وەک لیکوو دەچێ. لە شوێنی شەداری وەک قامیشەڵان و مێشەڵانی دەوروبەری زەلان دەژی. (314)

## تۆرەمەی ماسیگرە (52F)
Family LARIDAE

* باڵندەی ڕەشەبا (؟)، ماسیگرەک، ماسیگیرە، ماسیەوچنە، مایی چنەک.

باڵیان درێژ و لاقیان بەپەردەیە، زیاتر بەپۆل دەگەڕێن. کۆچەرین. ماسی خۆرکەکانیش هەر لەم تۆرەمەیەن. ماسیگرەکان زۆرتریان سپین و جێ جێی



لەشیان ڕەشی ئاماڵ بۆرە. لەماسی خۆرکەکان گەورەترن، نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن، لەسەر عەرز یا لەناو ڕەوەزی گەوەڕی کەنار دەریادا هێلانە ساز دەکەن.

ماسی خۆرکەکان فڕینیان جوانترە، دندووک و باڵیان تیژترە. لە کاتی فڕین دندووکیان سەرەو ژوور ڕادەگرن. پەڕ و باڵیان سپییە، هێندێکیان پاش ملیان ڕەشە. لە حەواوە بۆ ماسی گرتن خۆ لەناو ئاو داوێن. ناتوانن جوان پێڕۆ بکەن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر عەرز یا لەناو ئاوەگرەکاندا هێلانە ساز دەکەن. بەگیانلەبەرە بچووکە ئاوییەکان و دانەوێڵەی گیا و گۆڵان دەژین.

ماسی خۆرکەکان بریتین لە: ماسی خۆرکە، ماسی خۆرکەی بۆر، ماسی خۆرکەی خەزەری، ماسی خۆرکەی دندووک ئەستوور، ماسی خۆرکەی دەنگ بۆڕ، ماسی خۆرکەی ڕەش، ماسی خۆرکەی ڕەشی باڵ سپی، ماسی خۆرکەی سەربەکڵاوەی بچووک، ماسی خۆرکەی سەر بەکڵاوەی گەورە، ماسی خۆرکەی قەشانی دندووک ڕەش. ماسی خۆرکەی قەشانی دندووک زەرد، ماسی خۆرکەی گۆنا سپی.

ماسیگرەکان بریتین لە: ماسیگرە، ماسیگرەی بچووک، ماسیگرەی بۆر، ماسیگرەی پشت ڕەشی بچووک، ماسیگرەی پشت ڕەشی گەورە، ماسیگرەی دندووک باریک، ماسیگرەی زێوکە، ماسیگرەی سەر ڕەشی بچووک، ماسیگرەی سەر ڕەشی گەورە.

ماسی خۆرکە (338)

پرستوی دریایی معمولی
Sterna hirundo
Sterne pierregarin
Common Tern

**٣٥** سانتیمێترە. پشتی بۆرە. دندووک و لاقی سوورە، سەری دندووکی ڕەشە، هاوینان پاش ملی ڕەش هەڵدەگەڕێ، بەرچێڵەی سپییە، زستانان نێوچاوانی سپی و دندووکی ڕەش هەڵدەگەڕێ. لە قەراغ دەریا، گۆلاوی شیرین، چۆماو، ئاوگر و گۆلی بەربەرین دەبینرێ. لەسەر تەپۆڵکە خیزەڵانەکان یا کەنار دووڕگەکاندا هێلانە ساز دەکا. کۆچەرییە و هاوینان زۆر دەبێ. (171-169)

ماسی خۆرکە-ی بۆر (339)

پرستوی دریایی تیره
Sterna repressa
Sterne á joues blanches
White-cheeked Tern

**٣٣** سانتیمێتره. پەڕ و باڵی لە هەموو وەرزەکان لەهی ماسی خۆرکە دەچێ تەنیا هاوینان نەبێ کە بەرزگی بۆر هەڵدەگەڕێ. گۆنای سپییە. پشتی شین بۆرە. زستانان بۆرایی بەرزگی نامێنێ هەر بۆیە ناسینەوە و هەڵاواردنی لەوانی دیکە دژوار دەبێ. دندووکی زستانان سووری ئاماڵ ڕەشە. لە ئیشکان نابینرێ. دەنگ و کردەوەی هەر وەک ماسی خۆرکە دەچێ. هاوینان زۆر دەبێ. (171)

ماسی خۆرکە-ی خەزەری (340)

پرستوی دریایی خزر
Hydroprogne tschegrava
Sterne Caspienne
Caspian Tern

**٥٢** سانتیمێتره. سەر و لاجانگ هەتا دەگاتە ژێر چاوی ڕەشە. کلکی دوو لکە. دندووکی سوور و ئەستوورە و جاری وایە ئاماڵ زەرد دەبێ. ڕەنگی ڕەشی سەری زستانان بۆر هەڵدەگەڕێ، ڕەنگی ئەم باڵندەیە بەباڕی بۆرە. پشتی پنۆک پنۆکی ئاماڵ قاوەییە. زیاتر لە کەنار دەریا دەژی، بەڵام جاری وایە لە کەنار گۆل و چۆماوە گەورەکانیشدا دەبینرێ. (170-171)

ماسی خۆرکە-ی دندووک ئەستوور (341)

پرستوی دریایی نوک کلفت
Gelochelidon nilotica
Sterne hansel
Gull-billed Tern

**٣٧** سانتیمێتره. دندووکی ڕەشە. کلکی بۆرە و کەمێک دوو لکە. زۆرتر وە ماسی خۆرکەی دەنگ ناخۆش دەچێ. لاقی ڕەش و تا ڕادەیەک لە ئەوانی تر درێژترە. ڕەشایی سەری زستانان سپی هەڵدەگەڕێ. ئەم باڵندەیە بەباڕی سەری ئاماڵ نارنجییە و تووکی دەوری چاوی بۆرە. بەپێچەوانەی ئەوانی تر لە ئیشکایی مێش و مەگەز ڕاو دەکا. کەم وا هەیە بۆ ڕاو کردن خۆ لەئاو باوێ. لە گۆلاوی سوێر، خیزەڵانی کەنار ئاوان بەگەل دەژین و هەر لەم شوێنانەش هێلانە دەکا. (170-171)



ماسی خۆرکە-ی دەنگ بۆڕ (342)

پرستوی دریایی بد صدا
Sterna sandvicensis
Sterne caugek
Sandwich Tern

**٤٠** سانتیمێتره. تا ڕادەیەک گەورەیە و پەڕ و باڵی درێژە. کلکی قوڵە و دوو لکە. دندووکی ڕەشە و سەری دندووکی زەردە. لاقی ڕەشە. جاری وایە بەرزگی کاڵ هەڵدەگەڕێ. لە حاڵی پەشێوی و نیگەرانیدا تووکی پاش ملی قرژ دەبن و وەک کاکۆڵیان لێدێ. زستانان سەری سپی هەڵدەگەڕێ و کاکۆڵیشی ڕێ ڕێ دەبێ. بەباڕی ئەم باڵندەیە ئاماڵ سپییە و جاری وایە زەردایی سەری دندووکی نامێنێ. لە دەریادا دەژی. بەپۆل لە کەنار دەریا هێلانە ساز دەکا. (170-171)

ماسی خۆرکە-ی ڕەش (343)

پرستوی دریایی سیاه
Chlidonias niger
Cuifette noire
Black Tern

**٢٤** سانتیمێتره. کاتی کورک بوون تەواو بۆرە. لە حەواوە بۆ گرتنی نێچیر خۆ دەخاتە ئاوەوە. پەڕ و باڵی بۆری ئاماڵ ڕەشە، پەڕی ژێر باڵی سپییە. کاتی تۆولەک بەدەنی پنۆک پنۆک دەبێ. زستانان نێوچاوان و مل و بەرزگی سپییە و خاڵی گەورە و ڕەشی لەلاسینگ و پێش باڵانی هەیە. دندووکی ڕەش و باریک و درێژە. زۆر نەوی بەسەر ئاودا دەفڕێ و زیندەواری سەر ئاو ڕاو دەکا. کەم وا هەیە بچێتە ناو ئاو. لەکەنار گۆلاو و جاری واشە لە نزیک دەریادا دەبینرێ. (169)

ماسی خۆرکە-ی ڕەشی باڵ سپی (344)

پرستوی دریایی بال سفید
Chlidonias leucopterus
Guifette leucoptére
White-winged Black Tern

**٢٣** سانتیمێتره. هاوینان پەڕ و باڵی ڕەشن و شاباڵ و سەری کلکی سپییە. ژێر باڵی تەواو ڕەشە. دندووکی هاوینان سوورە و زستانان ڕەش. زستانان جیاوازی لەگەڵ ماسی خۆرکەی ڕەش لەوەدایە کە خاڵی ئاماڵ ڕەشی لە سینگیدا نییە؛ بۆرایی سەریشی کەمترە، بەڵام لەو گەورەترە. ئاکار و کردەوەی لەهی ماسی خۆرکەی ڕەش دەچێ و هەر لەو شوێنانە دەژی کە ئەو دەژی. (169)

ماسی خۆرکە-ی سەر بەکڵاوەی بچووک (345)

پرستوی دریایی کاکلی کوچک
Sterna bengalensis
Sterne voyageuse
Lesser Crested Tern

**٣٦** سانتیمێترە. لە ماسی خۆرکەی سەر بەکڵاوەی گەورە دەچێ. کلکی ئاماڵ بۆرتر و دندووکی زەردی نارنجییە. لە دەریادا دەلەوەڕێ و لە کەنار دەریا وچان دەدا. لەسەر هەرد هێلانە دەکا. (171)

ماسی خۆرکە-ی سەر بەکڵاوەی گەورە (346)

پرستوی دریایی کاکلی
Sterna bergii
Sterne huppée
Great Crested Tern

**٤٨** سانتیمێترە. سەر و پاش ئەستۆی تووکی درێژی هەیە و بووە بەکاکۆڵ. ڕەشە، نێوچاوانی سپییە. کلکی دوو لکە و بۆرایی هەیە. دندووکی زەردی ئاماڵ بۆرە؛ ئەستوورایی دندووکی ئاماڵ کەسکە. لاقی ڕەشە و بەرزگی یەکدەست سپییە. زستانان سپیایی نێوچاوانی زۆرترە، سەری خاڵخاڵ دەبێ. بۆ گرتنی ماسی لەبەرزەوە خۆ دەخاتە ئاوەوە. لە دەریا دەژی و لە کەناران وچان دەدا. بەگەل لەسەر عەرز هێلانە دەکەن. (171)

ماسی خۆرکە-ی قەشانی دندووک ڕەش (347)

پرستوی دریای پشت دودی
Sterna anaethetus
Sterne bridée
Bridled Tern

**٣٦** سانتیمێترە. پشتی یەکدەست قاوەیی و بەرزگی سپییە. سەر، پاش ئەستۆ و دەوری چاوی ڕەشە و نێوچاوان و سەرەوەی چاوی سپییە. کلکی دوو لکی بۆری پڕ ڕەنگە. شاپەڕی قەراغ کلکی سپییە. دندووکی، ڕەشە. لە دەریا دەژی و تەنیا بۆ هێلکە و جووچکە دێتە ئیشکایی. بەگەل لە قەراغ دەریا هێلکە دەکا. هاوینان زۆرە. ٠ (171)



ماسی خۆرکە-ی قەشانی دندووک زەرد (348)

پرستوی دریایی کوچک
Sterna albifrons
Sterne naine
Little Tern

**٢٤** سانتیمێترە. دندووکی زەردە؛ سەری دندووکی ڕەشە. لاقی زەرد و نێوچاوانی سپییە. هاوینان سپیایی نێوچاوانی لەگەڵ ڕەشایی سەر و دەوری چاوی دژایەتییەکی تایبەتی هەیە. زستانان ئەستۆی بۆر دەبێ و بۆ لای ملی ڕەش هەڵدەگەڕێ. کلکی دوو لکە. لەسەر ئاو لەنگەر دەبەستێ و بۆ گرتنی ماسی خۆ دەخاتە ئاوەوە. لە کەنار گۆل و دەریا دەژی. (171-169)

ماسی خۆرکە-ی گۆنا سپی (349)

پرستوی دریایی گونه سفید
Chlidonias hybrida
Guifette moustac
Whiskered Tern

**٢٥** سانتیمێترە. لاجانگی سپییە، سەری ڕەشە، بەرزگی بۆری توندە. کاتی فڕین سپیایی ژێر باڵ و کلکی بەجوانی دیارە. دندووکی هاوینان سووری پڕ ڕەنگە و زستانان ئاماڵ ڕەش دەبێ. بۆ گرتنی ماسی خۆ دەخاتە ناو ئاوەوە. لە قەراغ گۆلاوان دەژی. لەنێو زەل و شاماندا هێلانەی سەراو ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (169)

ماسیگرە (350)

کاکایی نوک سبز
Larus canus
Goéland cendré
Common Gull

٤٠ سانتیمێترە. وەک ماسیگرەی زێوکە دەچێ. پشتی بۆری کاڵە؛ شاباڵی ڕەشە و سەری باڵی سپی پنۆک پنۆکە. لاق و دندووکی باریک و زەردی ئاماڵ کەسکە. دندووکی خاڵی سووری تێدایە. زستانان سەری ڕێ ڕێ دەبێ. بەباڕی خەتی ڕەشی بەسەر کلکی سپیدا کشاوە. بەجووجەڵەیی قاوەیی ئاماڵ بۆرە؛ دندووکی ڕەش و لاقی قاوەیین. لە قەراغ دەریا، ئاودڕ و ئاوی زەویوزاران دەبینرێن. لەسەر ڕەوەزی کەنار دەریا و جاری واشە لە گۆل و زۆنگان هێلانە دەکا. (160)

ماسیگرە-ی بچووک (351)

کاکایی کوچک
Larus minutus
Mouette pygmée
Little Gull

٢٧ سانتیمێترە. هاوینان سەری ڕەشە و زستانان بۆر دەبێ. دندووکی هاوینان سووری توندە و زستانان ڕەش هەڵدەگەڕێ. لاقی ڕەشە. بەباڕی بەرزگی سپی و پشتی خەتی بۆری پێداهاتووە؛ سەری شاباڵی ڕەشە. لە کەنار دەریا، ڕووبار و تەنانەت جاری وایە لەناو زەویوزاران دەبینرێ. بەگەل لە زۆنگ و زەلان یان خیزەڵانی کەنار گۆلان هێلانە دەکا و جووچکە هەڵدێنێ. (158-159)

ماسیگرە-ی بۆر (352)

کاکایی دودی
Larus hemprichii
Goéland d'Hemprich
Hemprich's Gull

٤١ سانتیمێترە. سەر و ملی قاوەییە. پاش ملی خەتێکی ئاماڵ سپی پێداهاتووە. بەرسینگی قاوەییە. زەردگوێزییە و سەری شاباڵی سپییە. ژێر باڵی ڕەشە. بەرزگ و کلکی سپییە. دندووکی ئاماڵ کەسکە؛ سەری دندووکی سوور و ڕەشە. لاقی زەردەڵەیە. لەسەر عەرز لە دوڕگەکان هێلانە ساز دەکا. (158)

ماسیگرە-ی پشت ڕەشی بچووک (353)

کاکایی پشت سیاه
Larus fuscus
Goéland brun
Lesser Black-backed Gull

٥٣ سانتیمێترە. هاوینان لاقی زەردە، زستانان کاڵ دەبێ. بەباڕی بەدەنی قاوەیی پنۆک پنۆکە؛ دندووکی ئاماڵ ڕەش و لاقی گۆشتنی ئاماڵ قاوەییە. ئەم باڵندەیە سەر و ملی سپییە. بەدەنی بۆری ئاماڵ ڕەشە. کلکی سپییە. دندووکی ئاماڵ زەردە. لە کەنار دەریا دەبینرێ. (160)



ماسیگرە-ی پشت ڕەشی گەورە (354)

کاکایی پشت سیاه بزرگ
Larus marinus
Goéland marin
Great Black- backed Gull

٧٢ سانتیمێترە. لەکاتی کورک بووندا لاقی ئاماڵ سپی دەبێ؛ هەروەها دەنگیشی بۆرتر دەبێ. پشتی ڕەشە. سەر و مل و زگ و کلکی سپییە، دندووکی زەردەڵەیە. بەباڕی پشتی قاوەیی پنۆک پنۆکە؛ شاباڵ و سەری دندووکی ئاماڵ ڕەشە، سەر کلکیشی قاوەییە. لە دەریا، بەتایبەت لە کەناران دەژی. (160)

ماسیگرە-ی دندووک باریک (355)

کاکایی صورتی
Larus genei
Goéland railleur
Slender-billed Gull

* بەتەچەرمەڵە (؟)

٤٢ سانتیمێترە. دندووکی سوور و تیژە. لاقی سووری تاریکە. لەکاتی کورک بوون سەر و ملی سپی دەبێ و بەرزگی سپی ئاماڵ زەرد. بەباڕی لاقی ئاماڵ زەردە و سەر کلکی خەتی ڕەشی تێدایە. ئەم باڵندەیە پشتی بۆرە و سەری کلکی ڕەشە. زستانان زۆرتر دەبێ. بەتاق و پۆل لە کەنار دەریا و ئاودڕ دەبینرێ. لەنێو دوڕگەکانی زل و شام و قەراغ ڕووباران هێلانە ساز دەکا. (158-159)

ماسیگرە-ی زێوین (356)

کاکایی نقرەای
Larus argentatus
Goéland argenté
Herring Gull

٥٥ سانتیمێترە. دندووکی زەرد و ئەستوورە و خاڵی سووری لە سەردا هەیە. سەر و مل و کلکی ئاماڵ سپییە. لاقی ئاماڵ زەردە. پشت و باڵی بۆرە. سەری شاباڵی ڕەشە. بەباڕی ئەم باڵندەیە قاوەیی پنۆک پنۆکە. لە تەمەنی یەک ساڵیدا پشتی بۆر هەڵدەگەڕێ. لە دوڕگەکاندا لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (160)

ماسیگرە–ی سەر ڕەشی بچووک (357)

کاکایی سر سیاه
Larus ridibundus
Mouette rieuse
Black-headed Gull

٣٧ سانتیمێترە. دندووکی سووربیاوە، سەری ڕەشە. مل و بەرزگ و کلکی سپییە. لاقی باریک و سوورە. پشتی بۆرە. شاباڵی سپییە. سەر شاباڵی ڕەشە. بەباڕی سەری ئاماڵ سپییە و دەوری چاوی پنۆک پنۆکە؛ هەروەها پشتی بۆرە و باڵی قاوەیی ڕێ ڕێیە. لە کەنار دەریا، لەسەر ڕووباران، لە قەراغ گۆڵ و زەویوزاران دەبینرێ. بەگەل لەنێو گۆڵان یان چیمەن و خیزەڵانی کەنار دەریاچەکان هێلانە ساز دەکا. (158-159)

ماسیگرە–ی سەر ڕەشی گەورە (358)

کاکایی بزرگ
Larus ichthyaëtus
Goéland ichthyaëte
Great Black-headed Gull

* قاقڵی بازان (؟)

٦٧ سانتیمێترە. سەری ڕەشە، دندووکی زەردی سەری سوورە و خەتی ڕەشی پێداهاتووە. ملی سپییە. بەرزگی بۆرە. باڵ و پشتی ئاماڵ شینە. سەری ڕەش بەڵەکە. لاقی کەسکە. زستانان سەری ئاماڵ سپی پنۆک پنۆکە. باڵندەیەکی زۆر دڕە و لە کەنار دەریا و گۆڵی سوێر دەژی. کەم وا هەیە بێتە کەنار ئاوی شیرن. زستانان زۆرە. (158-159)

## تۆرەمەی مریشکاویلە (53F)

Family RALLIDAE

ئەو باڵندانە لە گۆڵ و زەلاندا دەژین. مەلەوانی چاکن. زۆرتر خۆ حەشار دەدەن. باڵیان کورتە، کلکی کورتیان قیت ڕادەگرن. باڵێک دەفڕن. لەکاتی فڕیندا لاقیان شۆڕ ڕادەگرن. ڕەش بەشەکان گەورەترن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر عەرز یان لەناو قامیشەڵان هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: ڕەش بەشە، ڕەش بەشەی دندووک سوور، تاوسە، مریشکاویلە، مریشکاویلەی بچووک، مریشکاویلەی خەنەیی، مریشکاویلەی دندووک سەوز، مریشکاویلەی سوور بەڵەک.



ڕەش بەشە (359)

چنگر
Fulica atra
Foulque macroule
Coot

* ڕەش بەش، کوڕەبەشە، گامارولە، گامارۆ، گامارۆلە، گامارۆڵە، مریشکەڕەشە (؟) مریشکی حەبەشە (؟).

٣٧ سانتیمێترە. ڕەش و بەشە، لاقی شینە، قامکەکانی هەر یەکە بەجوێ پەردەیان هەیە. بەباڕی بۆرە و بەرسینگ و ملی مەیلەو سپییە. زیاتر لە ئاو دایە. بینە دەکێشێ. زستانان بەگەل دەژی. بەدژواری هەڵدەفڕێ؛ دەبێ ماوەیەک بەسەر ئاودا ڕابکا، لە ئاوی تفت و شیرندا دەژی. لەناو قامیش و گیاوگۆڵی قەراغ ئاو هێلانە دەکا. (122)

ڕەش بەشە–ی دندووک سوور (360)

چنگر نوک سرخ
Gallinula chloropus
Poule d’eau
Moorhen

٣٢ سانتیمێترە. ڕەشە، زۆرتر لە قەراغ ئاوگر و گۆڵ و گۆڵاوان دەبێ. لاتەنیشتی خەتی سپی تێدایە. لاقی شینە. ڕانی خەتی سووری بەدەوریدا هاتووە. دندووک و نێوچاوانی سوورە و سەری دندووکی زەردە. بەباڕی قاوەیی مەیلەو بۆرە؛ بەرزگی سپییە و نێوچاوانی قاوەیی مەیلەو کەسکە. بۆ فڕین دەبێ ماوەیەک بەسەر ئاودا ڕا بکا. نەوی فڕە؛ لەکاتی فڕین لاقی شۆڕدەبنەوە. زستانان بەگەل دەژی. لە گیاوگۆڵی ناو ئاو هێلانە دەکا. (122)

تاوسە (361)

طاووسک
Porphyrio porphyrio
Poule sultane bleue
Purple Gallinule

* مریشکی زەلکاو (؟)

٤٧ سانتیمێترە. شینی مەیلەو بنەوشە. دندووکی درێژە. چاو، نێوچاوان و لاقی سوورە. زەنگە درێژە. بەباڕی بۆری مەیلەو شینە. ئەو باڵندەیە بەقامیشان هەڵدەچێ.

لەکاتی فڕین قاچی شۆڕ دەکاتەوە. لە قامیشەڵانی قەراغ شام دەژی و هەر لەوێ هێلانە دەکا. (122)

مریشکاویلە (362)

یلوه آبی
Rallus aquaticus
Râle d’eau
Water Rail

٢٧ سانتیمێترە. دندووکی سوور و درێژە. پشتی قاوەییە؛ خاڵی ڕەش ڕەشی تێدایە. سەر و مل و سینگی بۆری مەیلەو شینە. بەرزگی ڕێ ڕێیە. لاقی قاوەیی مەیلەو بۆرە. سڵە؛ زۆرتر خۆ حەشار دەدا. بەدەنگی دەناسرێتەوە. لە گیاوگۆڵی ناو ئاو، قامیشەڵانان، شام و گۆلاوان، قەراغ جۆگە و جۆباران دەبینرێ. لەناو جەگەنی تەنکاواندا هێلانە دەکا. (121)

مریشکاویلە-ی بچووک (363)

یلوه کوچک
Porzana parua
Râle poussin
Little Crake

١٨ سانتیمێترە. دندووکی سوورە، لاقی کەسکە. پشتی قاوەیی زەیتوونییە. تووکی ژێر کلکی ڕێ ڕێیە. مێیە بەرزگی زەردی مەیلەو بۆرە. کردەوەی وەک مریشکاویلەی خاڵخاڵە. لەناو قامیشەڵان و شام و گیای ناو ئاو دەبینرێ. (121)

مریشکاویلە-ی خەنەیی (364)

یلوه حنائی
Crax crex
Râle de genêts
Corncrake

٢٦ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی مەیلەو زەردە؛ پشتی خاڵی ڕەشی تێدایە. سەر و سینگی بۆرە. باڵی خەنەییە. بەتەنیا دەژی. بەیان و ئێواران لەوەڕ دەکا. خۆی لەگیاوگۆڵی بەرزدا حەشار دەدا. کەم وا هەیە خۆ نیشان بدا. لە زەویوزار و ناو گیاوگۆلان هێلانە دەکا. (121)



مریشکاویلە-ی دندووک سەوز (365)

یلوه نوکس بز
Porzana pusilla
Ràle de Baillon
Baillon’s Crake

١٧ سانتیمێترە. وەک مریشکاویلەی چووک دەچێ. پشتی خورمایی ڕەنگە؛ ڕێ ڕێی سپی تێدایە. ئاتەگی قاوەییە؛ خەتی سپی سپی تێدایە. مل و سینگی بۆری مەیلەو شینە. کردەوەی وەک مریشکاویلەی بچووکە. لە زەلی پڕ گیاوگۆڵ دەبینرێ. (121)

مرشکاویلە-ی سووربەڵەک (366)

یلوه خالدار
Porzana porzana
Marouette ponctuée
Spotted Crake

٢٢ سانتیمێترە. پشتی قاوەیی مەیلەو زەیتوونییە، خەتی سپی سپی تێدایە. لاقی سەوزە. دندووکی زەردە، ئەستوورایی دندووکی سوورە. سینگی قاوەیی مەیلەو بۆرە. بەتەنیا دەژی. بەیانی زوو یان تاوپەڕی ئێواران دەست دەکا بەگەڕان و لەوەڕ. لەشام، گۆل، گۆلاو، ئاوگری پڕ لە گیا و قەراغ جۆباران دەبینرێ. لەناو گیا هێلانە دەکا. (121)

## **تۆرەمەی مریشکەکێوی** (54F)
Family TETRAONIDAE

مریشکەکێوی (367)

سیاه خروس
Lyrurus mlokosiewiczi
Tétras du Caucase
Caucasian Black Grouse

٤٠ هەتا ٤٨ سانتیمێترە. نێرە تەواو ڕەشی مەیلەو کەسکە. پەڕی ژێر باڵ و ژێر کلکی سپییە. شاپەڕی کلکی درێژە؛ بۆ خوارێ شۆڕ بۆتەوە. پۆپەی سوورە. مێیە خورمایی ڕەنگە و خاڵخاڵی ڕەشە. توند دەفڕێ. لەنێو پنج و قۆپەنی گیاوگۆڵی کوێستانان دەژی. زستانان دەچێتە ناو لێڕەواران. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (100)

## **تۆرەمەی مەلەڕۆژە** (55F)
Family NECTARINIIDAE

مەلە ڕۆژە (368)

شهدخور
Nectarinia asiatica
Soui-manga asiatique
Purple Sunbird

**٩،٥** سانتیمێترە. باڵندەیەکی زۆر بچووک و بزۆزە. دندووکی درێژ و باریک و خوارە. نێرە هاوینان تەواو ڕەشە. تێکەڵاوی لەگەڵ بنەوش و سەوزە. خەتێکی قاوەیی ئاماڵ سووری لەسەر سینگە. لەهەر دوو لای سینگیدا خاڵی سوور و زەرد هەیە. مێیە پشتی قاوەیی ئاماڵ سەوزە و بەرزگی زەردی ڕوونە. شاپەڕی کلکی قاوەییە و سەری ئەو شاپەڕانە سپییە. نێرە زستانان وەک مێیە دەچێ. ئەو باڵندەیە بەجووت دەگەڕێ و شیرەی گوڵان دەمژێ. لەنێو پنچکان، مێشەڵان، داری دەوری زەویوزاران، باغ و لێڕەواری چڕ دەژی. هێلانەکەی وەک هەرمێ دەچێ و بەلقی دار و پنچکانەوەی هەڵداوەسێ. (341)

## **تۆرەمەی نکێنە** (56F)
Family RECURVIROSTRIDAE

باڵندەی تەنکاوانن. لاقیان باریک و درێژە. بەڵەکن، دندووکیان درێژە. لە قەراغ تەنکاوان هێلانە دەکەن. لە ئاوی تەنکدا دەلەوەڕێن. بریتین لە: چەکمەسوورە، نکێنە.

چەکمەسوورە (369)

چوب پا
Himantopus himantopus
Échasse blanche
Black- Winged Stilt

**٣٧** سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. لەکاتی فڕیندا لاقی لە کلکی تێدەپەڕێ. پشتی ڕەش و بەرزگی سپییە. پشت باڵی قاوەیی بۆرە. نێرە هاوینان پاشەستۆی ڕەشە و مێیەی سەر و ملی سپییە. ئەم باڵندەیە بەلۆقاوی بلێند زۆر بەهێمنی بەناو ئاودا دەڕوا. زۆر سڵە، دایمە جیکە جیکێتی. لە گۆل و گۆلاو و ئاوگراندا دەبینرێ. لەسەر گیای پڕ هێلانە ساز دەکا. (147)



نکێنە (370)

آوست
Recurvirostra avosetta
Avocette
Avocet

* مکێنە، نککێنە، نکنکە

**٤٢** سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. دندووکی درێژ و باریکە و سەری دندووکی قیتە. پەڕ و باڵی بەڵەکە. لاقی شینی ئاماڵ بۆرە. بەباڕی ئاماڵ قاوەیییە. لە کاتی فڕیندا لاقی لە کلکی درێژتر دیاری دەکا. خێرا خێرا و بەپێڕۆ بەناو ئاوی تەنکدا دەڕوا و دەلەوەڕێ. بۆ لەوەڕ نێو ڕووناوان دەپشکنێ. لە کەنار تەنکاو و خیزەڵانی دەم ئاودا دەبینرێ و هەر لەو شوێنانەش هێلانە دەکا. (147)

## **تۆرەمەی وەردۆک** (57F)
Family ANATIDAE

* وەردەک

لەم تۆرەمەیەدا گەلێ باڵندەی جۆر بەجۆر دەبینرێ. زۆربەیان خاوەنی باڵی تا ڕادەیەک باریک و نووک تیژن. کلک قوڵە و کورتن و سێ قامکی پێشەوەی قاچیان پەردەدارە. دندووکیان نەختێ پانە و قەراغ دندووکیان ددانەی هەیە و هەمیشە بەپۆل دەگەڕێن، کاتی کورک بوون نەبێ. زۆربەیان هێلانە بەتووکی نەرمی خۆیان لەسەر هەرد چێ دەکەن. بێچووەکانیان هەر کە لە هێلکە هاتنەدەر دەتوانن مەلە بکەن. ئەم تۆرەمەیە بریتین لە: (ئەلف) دندووک مشارەکان، (ب) قازەکان، (پ) قازمراوییەکان، (ت) قووەکان، (ج) مراوییەکان، (چ) مراوییە بینەکێشەکان.

ئەلف– دندووک مشارەکان Saw-bills

دندووکیان باریک، درێژ و مشارین. لە ئاوی قووڵدا مەلە دەکەن. بۆ ڕاوی ماسی بینە دەکێشن. بۆ هەڵفڕین دەبێ مەودایەک بەسەر ئاودا ڕا بکەن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگ نین. لەسەر زەوی یان لە کون و قەڵشتەبەرد هێلانە ساز دەکەن. ماسی و گیانلەبەرانی ناو ئاو ڕاو دەکەن. بریتین لە: کانوونی سەرسپی، کانوونی کاکۆڵدار، کانوونی گەورە، مراوی سەرسپی.

کانوون–ی سەرسپی (371)

مرگوس سفید
Mergus albellus
Harle piette
Smew

* سپی بەڵەک

٤٠ سانتیمێترە. وەک مراوی دەچێ. بەڵام چووکترە و دندووکی قوڵەترە. نێرە، سپی یەکدەست دەنوێنێ؛ خاڵی ڕەش چاوی داپۆشیوە. لە نزیکەوە کاکۆڵی بەڵەکی دیاری دەکا، تەنیشتی بۆرە، پشتی ڕەشە، لەکاتی فڕیندا بەڵەک دەنوێنێ. مێیە لە نێرە چووکترە، ڕەنگی بۆرە. کاکۆڵی مەیلەو قاوەییە، لاجانگی سپییە. لە گۆل، ئاوگر و چۆماواندا دەبینرێ. زستانان زۆر هەیە. (64)

کانوون–ی کاکۆڵدار (372)

مرگوس کاکلی
Mergus serrator
Harle huppé
Red-breasted Merganser

٥٧ سانتیمێترە. لە سۆنە چووکترە، دندووکی سوور و باریکە. کاکۆڵی دوو تیسکەی هەیە. سەری نێرە ڕەشی مەیلەو کەسکە، مێیە بەرچێڵەی سپییە، سەری خەنەییە، لە مێیەی سپی بەڵەک بۆرترە و کاکۆڵی بڵاوترە. زیاتر لە دەریادا دەژی و کەمتر دێتە ناو ئاوی شیرن. زستانان زۆرە. (64)

کانوون–ی گەورە (373)

مرگوس بزرگ
Mergus merganser
Herle biévre
Goosander

٦٥ سانتیمێترە. بەدەنی درێژ و خۆش ڕەنگە. دندووکی لە سۆنە باریکترە. لاقی زەردە. سەری نێرە ڕەشی مەیلەو شینە، سینگی سپی مەیلەو بۆرە، پشتی ڕەشە. مێیە سەری خەنەییە، کاکۆڵی هەیە، پشت و باڵی بۆری مەیلەو شینە. لە قەراغ گۆل و چەم و ئاوگران دەژی. (64)



مراوی–ی سەر سپی (374)

اردک سر سفید
Oxyura leucoephala
Érismature á tête blanche
White-headed Duck

٤٥ سانتیمێترە. سەری گەورەیە. کلکی قیت و تیژە، زیاتر کلکی ڕەپ ڕادەگرێ. نێرە لاجانگی سپییە، تەپڵی سەری ڕەشە، ملی ڕەشە، بەدەنی قاوەییە، ئەستوورایی دندووکی کووڕە، مێیە و بارِ قاوەیین و لاجانگیان کاڵترە. کردەوەیان زۆرتر وەک پێ بەقوونە دەچێ. نەوی دەفڕن. بۆ هەڵفڕین لەنەکاو دەردەپەڕن و باڵەفڕە دەکەن. لە ئاوی تفت و قامیشەڵانی دوور لە دەریا دەژین. لەناو گیاوگۆڵی کەنار ئاو هێلانە دەکەن. (63)

ب– قازەکان Geese

* سی

جۆرە مراوییەکی گەورەی بەقاژ و قووژن، لاقیان لە نێوەڕاستی زگیانە و یارمەتیان دەدا بەهاسانی پێڕۆ و چینە بکەن. بەپۆل دەگەڕێن. لەکاتی فڕیندا ڕێچکە دەبەستن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر قامیش و جەگەنی ناو شام و گۆلاندا هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: بووکەسی، خاسەسی، سی کوێرە، سی قەشانی بچووک، سی قەشانی گەورە.

بووکەسی (375)

عروس غاز
Branta ruficollis
Bernache á cou roux
Red-breasted Goose

٥٤ سانتیمێترە. لە گشت قازەکان جوانتر و چووکترە. پەڕ بەڵەکە، مل، سینگ و لاجانگی سوورە. خەتێکی پانی سپی بەتەنیشتیدا کشاوە. لاق و دندووکی چووک و ڕەشن. لە نێوانی چاو و دندووکی خاڵێکی سپی هەیە. لەکاتی لەوەڕ زۆر چوست و چالاکە. زیاتر بۆ وچان دێتە گەوەڕی گۆل و گۆلاوان. زستانان دەبینرێ. (51)

خاسەسی (376)

غاز خاکستری
Anser anser
Oie cendrée
Grey Lag Goose

* پینە (؟)، پینەپەڕۆ (؟)، پینەک (؟)، سی، سی خاسە، شاقاز، قاز، قەبەغاز (؟).

٧٥ هەتا ٨٥ سانتیمێترە. دندووکی لەوانی دی گەورەترە. پەڕ و باڵی بۆر و ڕێ ڕێیە، بەرزگی نەبێ، بەدەستە دەگەڕێن. زستانان هەم لە گۆل و شامدا و هەمیش لە مەزرا دەلەوەڕێ. لەناو قامیش و جەگەندا هێلانە ساز دەکا. کاتی هێلکە کردن و کورک بوون بەجووت دەگەڕێن. کۆچەرییە. (51)

سی کوێرە (377)

غاز پا زرد
Anser fabalis
Oie des moissons
Bean Goose

* سی لاڵە، قازەلاڵە

٧٠ هەتا ٨٧ سانتیمێترە. لە خاسەسی پڕ ڕەنگترە. لە دوورەوە سەر و ملی مەیلەو ڕەش دەنوێنێ. دندووکی درێژ و ڕەشی خاڵی ورد وردی نارنجی و جارجاریش سپی لە سەرە. ڕەنگی لاقی زەردە. زستانان زۆر هەیە. بەپێچەوانەی خاسەسی کە زۆر بەقاژ و قووژە ئەمەیان هەر زریوە زریوەتی. (52)

سی‌ـی قەشانی بچووک (378)

غاز پیشانی سفید کوچک
Anser erythropus
Oie naine
Lesser White-fronted Goose

* قازی بەرزگ ڕەشی بچووک

٥٣ هەتا ٦٥ سانتیمێترە. وەک سی نێوچاوان سپییە، بەڵام چووکترە. نێوچاوانی زۆرتر سپییە. دندووکی چووکترە، دەورەی چاوی زەردە و ئەو زەردایە بووە بەئاڵقە. شوێن و کردەوە و لەوەڕانی وەک سی نێوچاوان سپییە. (51)



سی‌ـی قەشانی گەورە (379)

غاز پیشانی سفید
Anser albifrons
Oie rieuse
White-fronted Goose

* ٦٥ هەتا ٧٥ سانتیمێترە. لە خاسەسی پڕ ڕەنگترە. نێوچاوانی سپییە. بەرزگی خاڵخاڵە و پنۆک پنۆکی ڕەشی تێدایە. لاقی زەردە. شوێن و شێوەی ژین و کردەوەی وەک خاسەسییە. (51)

پ- قازمراوییەکان Shelducks

ئەو باڵندانە تا ڕادەیەک وەک قاز دەچن. لە مراوی گەورەترن. ملیان درێژترە، دندووکیان قوڵە و بەقەوەتە. لاقیان وەک قازەکان لە ناوەڕاستی زگیان هاتۆتە دەر. هەر بۆیە بەهاسانی دەتوانن پێڕۆ بکەن. لە ڕووتەناندا دەلەوەڕێن. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگن. لە کوناندا هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: سوورەقانگ و هەڵەتانج.

سوورەقانگ (380)

آنقوت
Tadorna ferruginea
Tadorne casarca
Ruddy Shelduck

* سۆراویلک (؟)، سۆرەپەن (؟)، سوورە مراوی، کەرزەر، کەرسەڕ، مزراح (؟).

٦٣ سانتیمێترە. سووری خەنەییە. سەر و ملی کاڵترە. کلک، سەرباڵ، لاق و دندووکی ڕەشە. نێرەیان تۆقی ڕەشی بەملدا هاتووە. مێیەیان سەری مەیلەو سپییە. زیاتر بەجووت دەگەڕێن. زستانان لە خیزەڵانی کەنار چۆم و گۆل دەبینرێ؛ لە دەشت و ناو زەوییانیش دەنیشێ. لە کون و قەڵشتە بەرداندا هێلانە ساز دەکا. هەر کە جووجەی هەڵێنا یەک یەک بەدندووک بۆ ناو ئاو دەیانگوێزێتەوە. کۆچەرییە. (64)

هەڵەتانج (381)

**تنجه**

Tadorna tadorna

Tadorne de Belon

Shelduck

* ئاڵەتاج

٦٠ سانتیمێترە. جوورە مراوییەکی بەڵەکە. سەری ڕەشە، سینگی سوورە، شاباڵی ڕەشــە، لاقی مــەیلەو زەردە، دندووکی ســوورە. نێــرەیان پۆپەی ســوورە. وەک قــاز هەڵدەفڕێ. زۆرجار بەسەر ئاودا دەفڕێ. لە گۆلاو و ئاوی سوێردا دەژی. لە جێی چڵپاو دەهاڵێ. لە کونە ڕێوی و قەڵشتە بەرداندا هێلانە ساز دەکا. (64)

ت- قووەکان Swans

* قازی عێراقی (؟)

لە تۆرەمەی مراوین و لە هەمووان گەورەترن، ملیان درێژ و باریکە. هەمی لە ناو ئاو و هەمی لە ئیشکایی دەلەوەڕێن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکەن. ئەو جۆرانەی بینراون بریتین لە: قووی بچووک، قووی بێدەنگ، قووی گەورە.

قوو-ی بچووک (382)

**قوی کوچک**

Cygnus bewickii

Cygne de Bewick

Bewich's Swan

١٢٠ سانتیمێترە. لە هەموو قووان چووکترە. ملی قوڵەتر و هەروەها دەنگی نەرمترە. شێوەی ژیان و لەوەڕی وەک قووی گەورە وایە. (52)

قوو-ی بێدەنگ (383)

**قوی گنگ**

Cygnus olor

Cygne tuberculé

Mute Swan

١٥٠ سانتیمێترە. دندووکی زەردە. پۆپەی ڕەشە. لەکاتی مەلەدا ملی قەف دەکا. سەری شاباڵەکانی قرژ دەبن. بەتایبەت لەکاتی جغە دەرکردندا. کاتی کورک بوون نەبێ بەگەل دەژی. بێچووەکەی قاوەیی کاڵە. مەودای فڕینی زۆرە. لەکاتی فڕیندا شەقژنی باڵی دوور دەڕوا. (52)



قوو-ی گەورە (384)

**قوی فریادکش**

Cygnus cygnus

Cygne sauvage

Whooper Swan

١٥٠ سانتیمێترە. دندووکی ڕەشە، بەڵام ئەستوورایییەکەی زەردە. دەنگی وەک دەنگی شەیپوور وایە. لەکاتی بەپۆل فڕیندا قاژ و قووژیان بەرز دەبێتەوە و دەنگی باڵی نایە. بێچووەکەی بەڕەنگی قاوەیی کاڵە. لە قەراغ دەریا، شام، گۆل و چۆماندا دەژی. زستانان زۆر هەیە. (52)

ج- مراوییەکان Surface-feeding Ducks

* بت، مراقی، مەراقی، مراو، وەردۆک، وەردەکە.

ئەو باڵندانە لە ئاوگراندا دەژین، بۆ لەوەڕ زۆرجار سەری خۆیان لە ئاو ڕۆ دەکەن و ئەسقوند دەبن. لە فڕیندا زۆر بەهێزن. زیاتر نێرە و مێیەیان وێک ناچن. لەسەر عەرز لەناو گیاوگۆڵ هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: جوڕە، **خلخل**، دووکوڕە، سۆنە، قوون ڕەش، قەشان، لووت پان، مراوی سپیلکە (بەمێیەی هەریەک لەمانە دەگوترێ بۆرە، بۆرەجوڕە، بۆرەسۆنە و...)

جوڕە (385)

**خوتکا**

Anas crecca

Sarcelle d'hiver

Teal

* جوڕڕە، جوڕەمراوی، خوردەک.

٣٥ سانتیمێترە. لەناو تۆرەمەی خۆیدا لە هەمووان چووکترە. هەرچی نێرەیە سەری خەنەییــیە وخەتی کەسکی بەسەر چاودا کشاوە، هەروەها سەرشانی خەتی سپی پێداهاتووە. هەرچی مێیەیە خاڵخاڵە. ئەو باڵندەیە زۆر تیژباڵە. بەپۆل دەگەڕێن. نەوی فڕە. لە ئاوگر و جۆبار و قامیشەڵاناندا دەژی و هێلانە دەکا، زستانان زۆر هەیە. (61)

خلخل (386)

**خوتکای سفید**
Anas querquedula
Sarcelle d’été
Garganey

*** خلخله**

**٣٧** سانتیمێتره. کەمێک له جوورە گەورەتره، پاش ملی پانتر و دندووکی ڕاستتره. نێرەکەی لەکاتی فڕیندا بەپێش باڵی بۆری مەیلەو شین و سینگی قاوەیی و بەرزگی سپی دەناسرێتەوە، برۆی سپییه. کاتی تووڵەک نێره و مێیه وێک دەچن. کردەوە و شێوەی خلخل زۆرتر وەک لووت پان دەچێ. کەم وا هەیه بچێتە ناو ئاوی سوێر. لەناو گیاوگۆڵی پڕدا هێلانه دەکا. (61)

دووکوڕە (387)

**فیلوش**
Anas acuta
Canard pilet
Pintail

*** دووکوڕڕە**

**٥٥** سانتیمێتره. لەچاو ئەوانی تر کەمێک کزتر دێتە بەرچاو، هەروەها ملی درێژ و دندووکی تیژتره. سەری کلکی دوو لکه. نێره سەر و ملی قاوەییيه و بەرزگ و بەرسینگی سپییه، پشت و باڵی بۆره، لەکاتی تووڵەک نێره و مێیه وێک دەچن. بەجوانی پێڕۆ دەکا. تیژباڵه. زستانان زۆر هەیه. لەناو گیاوگۆڵی کەنار شام و زەل و ئاوگری بەگیاوگۆڵ هێلانه ساز دەکا. (61)

سۆنه (388)

**کلەسبز**
Anas platyrhynchos
Canard colvert
Mallard

*** سۆنێ، سەرسەوز، سەرکەسک**

**٥٧** سانتیمێتره. نێره سەری سەوزه، خاڵێکی بازنەیی سپی بەملدا کشاوه، بەرسینگی قاوەییيه، سینگ و بەرزگی بۆره، سێ چوار تووکی ڕەش لەسەر کلێنجەی هەڵگەڕاونەتەوە، دندووکی زەرده. بۆرەسۆنه قاوەیی خاڵخاڵه، لاقی مەیلەو زەرده.



نێره و مێیه هەردوو تیژباڵن، بەپۆل دەگەڕێن. زستانان زۆر هەیه. له گۆل و ئاوگر و چەماندا دەبینرێ؛ لەناو گیاوگۆڵی پڕی لێواری ئەم شوێنانه هێلانه دەکا. (61)

قوون ڕەش (389)

**اردک اردەای**
Anas strepera
Canard chipeau
Gadwall

**٥٠** سانتیمێتره. زیاتر لەگەڵ سۆنه و بۆره دەبینرێ. لەوان چووکتره و نێره له دوورەوە قاوەیی مەیلەو بۆر دەنوێنێ. ئەم باڵندەیه بەهۆی ئەوەی که پاشەڵی ڕەشە ئەو ناوەی بەسەردا براوه. دندووک بۆره، لاقی مەیلەو زەرده. مێیەی وەک بۆرەسۆنه و بۆره دووکوڕە دەچێ؛ بەڵام کلکی لەهی دووکوڕە قوڵەتره. شوێنی ژین و لەوەڕی وەک سۆنەیه. (61)

قەشان (390)

**گیلار**
Anas penelope
Canard siffleur
Wigeon

*** قەشانه**

**٤٥** سانتیمێتره. نێره سەری خەنەییيه، نێوچاوانی زەردی کاڵه، بەدەنی بۆره، سینگی کاڵتره، پاشەڵی ڕەشه. بۆرەقەشان وەک بۆرەسۆنەیه، بەڵام له ئەو چووکتره. له تەنکاو و قوڕەچڵپاوی ئاودڕ و ئاوگراندا دەلەوەڕێ. له ڕۆژدا بە ڕەو دەبینرێ. تیژباڵه. بەئاسانی پێڕۆ دەکا. زستانان زۆره. (61)

لووت پان (391)

**نوک پهن**
Anas clypeata
Canard souchet
Shoveler

*** غەلوخەدەنووک، قەلوخەدەنووک.**

**٥٠** سانتیمێتره. دندووکی پانه و ناوەکەی هەر لەوەوە پێ براوه. نێره پشتی ڕەش و خاڵخاڵه، سەری شینه، تەنیشت و بەرزگی خەنەییيه، سینگی سپییه، کاتی تووڵەک

وەک مێیە دەچێ. مێیەی وەک بۆرەسۆنە دەچێ و تەنیا سەرشانی شینە. لەناو گیاوگۆڵی زەل و ئاوگراندا دەبینرێ و هێلانە ساز دەکا. (62)

مراوی سپیلکە (392)
اردک مرمری
Anas angustirotris
Sarcelle marbrée
Marbled Teal

* بەحریلکە، مراوی سابوونی

**٣٨** سانتیمێترە. نەختێک لە جوڕە گەورەترە، هەروەها ملی درێژ و سەریشی گەورەترە. پەڕ و باڵی قاوەیی خاڵخاڵە، سەر بڕۆی ڕەشە. سەری باڵی سپییە. نێرە تووکی پاش ملی کەمێک درێژە و شێوەی کاکۆڵ دەدا. ئەو دەمەی کە باڕە بەرزگی زەردە و دوو خاڵی سپی لەسەر باڵە. زۆرتر بەجووت دەبینرێن. جاری وایە زستانان بەگەل دەگەڕێن. زۆرتر خۆ لەبەر چاو نەدیو دەکا. لە کەنار ئاوی شیرن لە شوێنی پڕ گیاوگۆڵ دەژی و هێلانە ساز دەکا. (64)

چ- مراوییە بینەکێشەکان Diving Ducks

لە ئاوی سوێر و شیرندا دەژین. زۆرتر لە قوولاواندا دەبن. لاقیان بەلای پاشەڵیانەوەیە. مەلەوانی چاکن. بۆ هەڵفڕین دەبێ کەمێک بەسەر ئاودا ڕا بکەن. بەگیاوگۆڵ و گیانلەبەرانی وردی ناو ئاو بەرێدەچن. بریتین لە: سەرسوور، سەرسووری بەحری، مراوی جغەدار، مراوی خەنەیی، مراوی ڕەشکە، مراوی سەر ڕەش، مراوی کلک درێژ، ملهوڕ، ملهوڕی ڕەش.

سەرسوور (393)
اردک سر حنایی
Aythya ferina
Fuligule milouin
Pochard

**٤٥** سانتیمێترە. نێرە و سەر ملی سووری قاوەیی یەکدەستە. سینگ ڕەشە. دندووکی شینی کاڵە و سەری دندووکی ڕەشە. لەکاتی تووڵک وەک مێیە دەچێ و پشتی بۆرترە. مێیە سەر و سینگی قاوەییە. کەمتر دێتە ئیشکایی. بەڕۆژ لە ئاودا وچان دەدا و تەنیا بەیان و ئێواران دەلەوەڕێ. بەهاسانی دەتوانێ خۆ لە ئاودا نقوم بکا و بینە بکێشێ. لە گەوەری پڕ گیاوگۆڵی شام و گۆلاندا دەژی. لەناو قامیشەڵانان هێلانە ساز



دەکا. زستانان زۆرە (62)

سەرسووری بەحری (394)
اردک تاجدار
Netta rufina
Nette rousse
Red-crested pochard

* سەرسووری کانیاوان، سەرسووری کانیاوێ، سەرسووری کاکۆڵدار، مراوی ژاپۆنی.

**٥٥** سانتیمێترە. نێرە دندووک سوورە، سەری خەنەییە، کاکۆڵی هەیە، پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە، مل و سینگ و پاشەڵی ڕەشە، قەبرغە و کلکی بۆرە. مێیەی قاوەیی کاڵە، لاجانگی بۆرە، سەری مەیلەو ڕەشە. لە قامیشەڵان و ئاوگر و گۆلە شیرن و تفتەکاندا دەژی. زستانان زۆرە. (62)

مراوی جغەدار (395)
اردک سیاه کاکل
Aytha fuligula
Fuligule morillon
Tufed Duck

**٤٣** سانتیمێترە. نێرە بەڵەکە. پشتی ڕەشە، یەک دوو تووکی وەک کاکۆڵ بەپاش ملدا هاتۆتە خوار. مێیە کاکۆڵی کورتترە و جاری وایە خەتی سپی بەکەنار دندووکیدا کشاوە. زستانان زۆر هەیە. لە گۆل و گۆلاو و ئاوگراندا دەژی. (62)

مراوی خەنەیی (396)
اردک بلوطی
Aythya nyroca
Fuligule nyroca
Ferruginous Duck

٤٠ سانتیمێترە. نێرە و مێیە ڕەنگیان خەنەییە. سەرباڵیان سپییە. تووکی ژێرەوەی پاشەڵیان سپییە. نێرەیان چاوی سپییە و هی مێیە قاوەیی. ڕەنگی مێیە لەهی نێرە توندترە. باریان زۆرتر وەک مێیە دەچێ و بەرزگی خاڵخاڵە. هاوینان زۆرە. لە گۆل و گۆلاو و شوێنی پڕ گیاوگۆڵ دەژی و هێلانە ساز دەکا. (62)

مراوی ڕەشکە (397)

اردک چشم طلایی

Bucephala clangula

Garrod á oeil d'or

Goldeneye

* شڵەکە، مراوی خڕە، مراوی ڕەشە.

٤٥ سانتیمێترە. نێرەیان پەڕ و باڵی بەڵەکە، مل و بەرزگی سپی و کلکی ڕەشە، سەری ڕەشە و بەرەوەی چاوی خاڵێکی سپی لێیە. لاقی مەیلەو زەردە. مێیەی پشتی بۆری پنۆک پنۆکە، سەری قاوەییە، خەتی سپی بەدەوری ملیدا هاتووە. لە لێواری ئاو و گۆلاندا دەبینرێن. (63)

مراوی سەر ڕەش (398)

اردک سر سیاه

Aytha marila

Fuligule milouinan

Scaup

٤٧ سانتیمێترە. نێرە سەر و کلکی ڕەشە؛ بەرزگی سپییە، پشتی بۆرە. دندووکی شین باوە. مێیە قاوەیی ڕەنگە. نێرە و مێیە هەردوو خەتی سپییان بەسەری باڵیدا هاتووە. مەلەوانی بێ هاوتان. بەگەل دەگەڕێن. لە کەنار دەریاچەکان دەبن. (62)

مراوی کلک درێژ (399)

اردک دم دراز

Clangula hyemalis

Harelde de Miquelon

Long-tailed Duck

نێرە ٥٣ و مێیە ٤١ سانتیمێترە. مراوییەکی سپییە و باڵی بۆرە. سەری بچووک و خڕە و دندووکی کورتە. نێرە لە زستاندا سەر و مل و زگ و شانی سپییە. باڵی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. لاجانگی ڕەشە. هاوینان دەبێتە قاوەیی توند؛ زگی سپییە. مێیە زستانان پشتی بۆرە و بەرزگی سپییە. دندووکی ڕەشە. هاوینان ڕەنگی پشتی توندتر دەبێ و سەری لە نێرە دەکا. لە دەریادا دەژی. (63)



ملهوڕ (400)

اسکوتر بال سفید

Melanitta fusca

Macreuse brune

Velvet Scoter

٥٥ سانتیمێترە. نێرە ڕەشە و لاجانگی خاڵی سپی هەیە. مێیە مەیلەو قاوەییە. نێر و مێیە پەڕی باڵیان سپییە. لە دەستەی بچووک و هەروەها تاق تاق لەسەر ئاوی پڕ شەپۆلدا هاتوچۆ دەکەن. (63)

ملهوڕ-ی ڕەش (401)

اسکوتر سیاه

Melanitta nigra

Macreuse noire

Common Scoter

٤٨ سانتیمێترە. نێرە هەموو گیانی ڕەشە. خەتێکی زەرد بەدرێژایی دندووکیدا کشاوە. ئەستوورایی دندووکی زیادایی هەیە. مێیە قاوەیی ڕەنگە، مل و ڕوومەتی سپییە. بەرزگی سپی سووریاوی پنۆک پنۆکە. ئەم باڵندەیە کاتی مەلەکردن کلکی درێژ ڕادەگرێ. لە دەریا و شامدا دەژی. (63)

## **تۆرەمەی هەڵۆ** (58F)

Family ACCIPITRIDAE

گەورەترین و وێک نەچووترین باڵندەی ڕاون. دندووکیان کورت و قەڵانگییە کە لای سەرەوەیان ددانەی نییە، جگە لە شەهێن. ملیان کورتە. لاقیان بەهێز و جنجرووکیان ئەستوور و قەڵانگییە. زیاتر تەنیا دەژین. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە، بەڵام مێیەکان گەورەترن. لەسەر دار، ڕەوەز یان عەرز هێلانە ساز دەکەن. گیانلەبەرانی وەک مشک، مار، باڵندە، بۆق و کرم دەخۆن. لەکەلاکی ئاژەڵانیش کەڵک وەردەگرن. بریتین لە: (ئەلف) بازەکان، (ب) دالاشەکان، (پ) سەقرەکان، (ت) شمقارەکان.

ئەلف- بازەکان Hawks

لەو تۆرەمەیەدا ئەوانە چووکترن. باڵیان کورت و خڕە و کلکیان درێژە. بەتوندی بەناو داراندا دەتوانن بەشوێن نێچیردا بفڕن و بۆ گرتن شارەزایی تەواویان هەیە. مێیە لە نێر گەورەترن. لەسەر دار هێلانە دەکەن. بریتین لە: باز، سەقر، واشە، واشەی گەورە.

باز (402)

**طرلان**

Accipiter gentilis

Autour des palombes

Goshawk

* بازی قزڵ (؟)، تەرلان، تەللان، شاباز.

**٤٨** تا **٦٠** سانتیمێترە. مێیە زۆر لە نێرە گەورەترە. ئەو باڵندەیە وەک مێیە واشەی زۆر گەورە دەچێ، بەڵام باڵی پان و نووک تیژترە. برۆی سپییە. پشتی بۆری ئامال ڕەشە. بەرزگی سپییە و ڕێ ڕێی وردی قاوەیی لێک نزیکی پێداکشاوە. ژێر پاشەڵی سپییە. بەباڕی پشتی کاڵترە و بەرزگی زەردی پڕ لە خاڵ و پنۆکی قاوەییە. بەتوندی بەسەر داراندا دەفڕێ و باڵندان ڕاو دەنێ. لە شوێنی پڕ دار، لێڕەوار چ لە دەشتان و چ لە کێوان دەژی. لە شوێنی دوورە دەستی ناو لێڕەواران هێلانە ساز دەکا؛ جاری وایە کۆنە هێلانان ئاوەدان دەکاتەوە. (75)

سەقر (403)

**پیغوی کوچک**

Accipiter badius

Épervier shikra

Shikra

نێرە **٢٩** و مێیە **٣٣** سانتیمێترە. نێرە زۆر وەک نێرەواشەی گەورە دەچێ، بەڵام بچووکترە و بۆرایی پشتی کاڵترە. مل و لاجانگی بۆری کاڵە و جارجار تۆقی لە مل پەیدا دەبێ. کلکی چوار تا پێنج خەتی پانی قاوەیی تێدایە کە کەوتوونە قەراغ چەنەی. بەرچێڵەی سپی ئامال زەردە و بۆرایی تێدایە. بەرزگی خورماییە. مێیە پشتی قاوەییترە و خەت و ڕێ ڕێی لەسەر شاپەڕی نێوەڕاستی کلکی هەیە. لە لێڕەواری تەنک و زەوی بەداری تاک و تەرا دەژی. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (98)

واشە (404)

**قرقی**

Accipiter nisus

Épervier d’Europe

Sparrow Hawk

نێرە **٢٧** و مێیە **٣٧** سانتیمێترە. باڵی کورت و خڕ و کلکی درێژە. نێرە پشتی بۆری



توندە و لاجانگی خورماییە. لە پاش ملیدا پنۆکی سپی دەبینرێ. بەپانایی بەرزگیدا خەتی باریکی قاوەیی مەیلەو سوور کشاون. کلکی خەتی بۆر و قاوەیی بەبەرینایییدا کشاوە. مێیە پشتی قاوەیی ئامال ڕەشە و برۆی سپییە. بەرزگی سپییە و خەتی باریک باریکی قاوەیی بەپانایییدا کشاوە. مێیە وەک باز دەچێ. بەباڕی وەک مێیە دەچێ، بەڵام قاوەییترە و ڕێ ڕێی بەرزگی ناڕێکە. لە شوێنی پڕ دار دەژی. لە لێڕەوار و جاری واشە لەناو پنچکی بڵیند و مێشاندا هێلانە ساز دەکا. زستانان لە شوێنی ئاوەڵاو کەم دار دەبینرێ. (75-98)

واشە-ی گەورە (405)

**پیغو**

Accipiter brevipes

Épervier á pieds courts

Levant Sparrow Hawk

**٣٢** تا **٣٧** سانتیمێترە. مێیە زۆر وەک مێیەواشە دەچێ. ژێر باڵی سپییە و نووکی باڵانی ڕەشە. چاوی قاوەیی ئامال سوورە نەک زەرد. باڵی ئەو باڵندەیە لەهی واشە درێژترە. نێرە لە نێرەواشە گەورەترە. پاش مل، پشت و پشت باڵی بۆری مەیلەو شینی ڕوونە. بەرزگی تا ڕادەیەک سپییە و لاتەنیشتی بەلای ژێرباڵییەوە زەردە. لاجانگی بۆرە. لاملی زەردە. مێیە پشتی لە مێیەواشە بۆرترە و خاڵی قاوەیی لەسەر ملە. بەباڕی بەرزگی تەواو سپییە و خاڵی گەورەی قاوەیی لێیە. ژینگەی وەک هی واشەیە. هاوینان بەڕادەیەکی کەم دەبینرێ. (75-98)

پ- باشووەکان Buzzards

باڵیان پانە و مل و کلکیان تا ڕادەیەک کورتە. زیاتر لە حاڵی لەنگەر بەستن و دەور لێدان لە ئاسماندا دەبینرێن. وەک هەڵۆی بچووک دەچن، بەڵام سەر و دندووکیان لەوان چووکترە. لە ڕووی ڕەنگی پەڕ و باڵیان کەمتر وا هەیە بناسرێنەوە. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە. لەسەر دار و ڕەوەزان هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: باشوو، باشووی چاو سپی، باشووی لاق درێژ، باشووی لاق تووکن، باشووی لێڕەواران.

باشوو (406)

سارگپه

Buteo buteo

Buse variable

Buzzard

٥٠ تا ٥٥ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی قاوەیی پڕ ڕەنگە. لە فڕیندا بەباڵی پان و کلکی گەورە و خڕ و ملی قوڵە دەناسرێتەوە. بەرزگی پنۆک پنۆکی سپییە و ئەو سپیایە کەم و زیاد دەبێ. جیاوازی لەگەڵ باشووی لاق درێژ لەوەدایە کە کلکی ڕێ ڕێیەو خەتی ڕەشی سەر کلکی پانە. پنۆکی گەورە و ئاماڵ ڕەشی ژێر باڵی زۆر دیار نییە و لاقی ڕووت و زەردە. سەری باڵی قیتە. کەمێک تەپ دەفڕێ. لە کێوپارەی دوورە دەست، زەویوزار و شوێنی پڕ دار دەژی. لەسەر ڕەوەزی کەنار دەریا، دار و زەوی نارێک هێلانە ساز دەکا. (76)

باشووی چاو سپی (407)

سارگپه چشم سفید

Butastur teesa

Buse aux yeux blancs

White-eyed Buzzard

٤٤ سانتیمێترە. نێرە و مێیە یەک ڕەنگە. کلکی ڕەش و درێژە. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە و ڕێ ڕێی ڕەشی تێدایە. خاڵێکی سپی و گەورەی لە پاش ملی دەبینرێ. بەرزگی سپی واشە و ڕێ ڕێی قاوەیی بەپاناییدا کشاوە. بەرچێلە و ملی سپییە و خەتی بەنێوەڕاست مل و کەنار لاجانگیدا کشاوە. چاوی سپی ئاماڵ زەردە. زۆرتر لەسەر دارتێل و داران هەڵدەنیشێ. توند دەفڕێ. لە شوێنی بەدار دەژی. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. (98)

باشووی لاق درێژ (408)

سارگپه پا بلند

Buteo rufinus

Buse féroce

Long-legged Buzzard

٦٠ تا ٦٥ سانتیمێترە. زۆر وەک باشوو دەچێ. ڕەنگی پەڕ و باڵی جۆر بەجۆرە؛ لە قاوەیی ئاماڵ خورمایی پڕ ڕەنگ بەبەرزگی ئاماڵ زەردی ڕێ ڕێی ڕەشەوە بگرە هەتا پەڕ و باڵ ڕەشی بەرزگ قاوەیی. سەری کاڵە. کلکی دارچینی ڕەنگە و ڕێ ڕێی نییە.



بەباڕی لە باڕی باشوو جوێ ناکرێتەوە. لە چیمەن و دەشتی پان و بەرین و ئیشک دەژی. لەسەر عەرز و جاری واشە لەسەر تاقە داران هێلانە دەکا. (76)

باشووی لاق تووکن (409)

سارگپه پر پا

Buteo lagopus

Buse pattue

Rough-legged Buzzard

٥٠ تا ٦٠ سانتیمێترە. بەباڵی درێژ و باریک و کلکی سپی و بەخەتی پان و بۆری سەری کلکی لە باشوو جوێ دەکرێتەوە. بەرزگ و ژێر باڵی سپیتر و سەری کاڵترە. لە فڕیندا پنۆک پنۆکی ژێر باڵی دیار دەکەوێ. لاقی هەتا پەنجانی تووکنە. بەباڕی کەمێک لە باڕی باشوو سپیترە. شەو نەوی دەفڕێ و لەنگەر دەگرێ و لەناکاو هێرش دەباتە سەر نێچیر. لە بەیار و کوێستانان و دەوروبەری زەلان دەبینرێ. (76)

باشووی لێرەواران (410)

سارگپه جنگلی

Pernis apivorus

Bondrée apivore

Honey Buzzard

٥٠ تا ٥٧ سانتیمێترە. لە فڕیندا بەباڵی پان. کلک و ملی درێژتر و سەری بچووکتر لەباشوو جیادەکرێتەوە. کلکی دوو خەتی باریکی هەیە و خەتێکی ڕەشی پان. پەڕ و باڵی ئەو باڵندەیە جۆر بەجۆرە. پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە و سەری بۆرە. بەرزگی پڕ خاڵ و میلە و جاری وایە تەواو قاوەییە. بەباڕی سەر و بەرزگی ڕێ ڕێیە. مشک و باڵندەی بچووک، هێلکە و گەرای مێش هەنگوینان دەخوا. لە کەنار شوێنی پڕ دار دەژی. لە کۆنە خانوو و کۆنە هێلانەی قەلەڕەشەدا هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆر هەیە. (76)

پ- دالاشەکان Vultures

زۆر گەورەن. تەپن. باڵیان زۆر درێژە. کلکیان کورتە و سەریان ڕووت، ـ بێجگە لە پیرۆزەـ. بالان دەکەنەوە جا دەفڕن. زۆرجار ئینسان ئەوانەی لەگەڵ هەڵۆ لێ تێک دەچێ، بەلام سەریان چووکترە و شێوە فڕینیشیان جیاوازە. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگن و زیاتر بەجووت دەگەڕێن. کەلاک دەخۆن. لەسەر دار و ڕەوەزی بەرز هێلانە ساز

دەکەن. بریتین لە: پیرۆزە، داڵی پشت سپی، ڕەشە داڵ، سیسارگ، شانەکوورە.

پیرۆزە (411)
**هما**
Gypaëtus barbatus
Gypaëte barbu
Bearded Vulture

* داڵەسوورە، سوورەداڵ، سوورەواڵە

**١٠٠ تا ١١٠** سانتیمێترە. زۆرتر وەک هەڵۆیەکی گەورە دەچێ تا وەکوو داڵاشێک. باڵی درێژ و تەسک و گۆشەدارە. کلکی درێژ و بۆری توندە. پشت و باڵی ڕەشی ئاماڵ بۆرە. سەری ئاماڵ زەردە. دەوری چاو و ئەستوورایی دندووکی ڕەشە. چەند چڵەمووی ڕەش وەک ڕدێن لەژێر چەنەی هاتووە. بەرزگی نارنجی ئاماڵ زەردە و سینگی تەواو نارنجییە. بەباری سەر و ملی بۆرە. لە کێوی بەرز و دوورە دەست بەتەنیا دەژی. هێلانەی خۆی لە ئەشکەوتی سەر ڕەوەزان ساز دەکا. (99-100)

داڵ–ی پشت سپی (412)
**دال پشت سفید**
Pseudogyps bengalensis
Vautour á dos blanc
White-backed Vulture

**٨٤** سانتیمێترە. داڵێکی بچووکی پڕ ڕەنگە. پاشەڵی سپییە و پشتی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. سینگ و بەرزگی قاوەیی ڕەشە و خاڵی وردی زەردی هەیە. سەر و ملی بۆری پڕ ڕەنگە. تووکی ژێر پاشەڵ و ڕانی سپییە. لە شوێنی کەمەدار و زەویوزاری نزیک ئاوایییان دەژی. کەمتر وا هەیە بچتە کێوان. (99)

ڕەشەداڵ (413)
**دال سیاه**
Aegypius monachus
Vautour moine
Black Vulture

* داڵ، داڵاش، داڵەگورگە، لاشخۆر، لاشەخۆر، لاشەوەر.

**٩٧ تا ١٠٥** سانتیمێترە. وەک شانەکوورە دەچێ، بەڵام سەری گەورەترە و دندووکی ئەستوورترە. کلکی درێژتر و سێ سووچە. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. ملی ڕووتی چێرەیی ئاماڵ شینە و دەوری ئەستوورایی ملی پۆلێک تووکی قاوەیی ڕواوە. دەنگ و



کردەوەی وەک شانەکوورە دەچێ. لە کێو و دەشتی دوورە دەست بەتەنیا دەژی. لەسەر دار و ڕەوەزی لێواری هەڵدێران هێلانە ساز دەکا. (99-100)

سیسارگ (414)
**کرکس**
Neophron percnopterus
Perconptére d’Egypte
Black Vulture

* تاسکەچەڵە، سمیارک، سەرگەڕ، سیالەک، سیسارک، سیسارگەکەچەڵە، کەپەنەک (؟)، کەپەنەک داڵ (؟)، کەچەلۆک، کەرگەز، کەرکەس.

**٥٣ تا ٦٥** سانتیمێترە. لاشە خۆڕێکی بچووکی ڕەش و سپییە. لەکاتی فڕیندا کلک و بەرزگ و سینگ و باڵی سپییە. شاباڵی ڕەشە و ئەو ڕەشایییە هەتا پاشەڵی کشاوە. سەر و ملی ئاماڵ زەردە و تووکی پێوە نییە. پاش ملی و ملی پڕ لە تووکی کورت و پرە. پەڕ و باڵی سپی چڵکنە و شاپەڕی ڕەشە. دندووکی لەلاشە خۆرەکانی تر باریکترە. بەباری ڕەنگی لە قاوەیییەوە بەرەو سپی دەگۆڕێ. ژینگەی وەک شانەکوورەیە و جاری وایە لەنێو زبڵی کەنار ئاواییانیشدا دەبینرێ. لەسەر ڕەوەزی بەرز هێلانە ساز دەکا. (99-100)

شانەکوورە (415)
**دال**
Gyps fulvus
Vautour fauve
Griffon Vulture

* خەرتەل، داڵەکەرخۆر، داڵەکەرخۆرە، کەرخۆر.

**٩٥ تا ١٠٣** سانتیمێترە. باڵی پان و درێژ و بڵاوی هەیە. کلکی چوار سووچی کورت و ئاماڵ ڕەشە. ژێر باڵی لەبن هەنگڵییەوە هەتا خوارایی باڵی خەتێکی کاڵی پێداهاتووە. سەری کورت و ملی ڕووتە و دەتوانێ لەنێو شانیدا خڕی بکاتەوە. پەڕ و باڵی بۆرە. سەر و ملی بەتووکی سپی زۆر کورت و ورد داپۆشراوە. دەوری ئەستوورایی ملی تووکی لێ ڕواوە و زەردی کاڵە و بەباری قاوەیییە. بەگەل دەبینرێ. ژینگەی ئەسڵی ئەو ناوچە کوێستانییەکانە. بەگەل لە ئەشکەوت و سەر تاتە بەردی شوێنە بەرزەکان هێلانە ساز دەکا. (99-100)

### ت– شمقارِەکان Harriers

لەشیان باریک و باڵیان درێژ و کەمێک کوورِە. لاق و کلکیان درێژە. دندووکیان زۆر ئەستوور نییە. نەوی فرِن و کاتی فرِین سەری باڵیان کەمێک قیت رِادەگرن. نێرە و مێیەیان یەک رِەنگ نییە، زۆربە نێرەکان لە مێیەکان چووکترن. لەسەر عەرز یان لەناو قامیشەڵانان هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: شمقارِی بۆر، شمقارِی زەلان، شمقارِی سپی، شمقارِی گەنمان.

شمقارِ–ی بۆر (416)

سنقر خاکستری
Circus cyaneus
Busard Saint-Martin
Hen Harrier

* حەسەنە سستە

**٤٣ تا ٥٠** سانتیمێترە. زۆر وەک شمقارِی گەنمان دەچێ، بەڵام پاشەڵی سپیترە و باڵ و کلکی پانترە. نێرە تەواو بۆرە؛ تەنیا سەری باڵی رِەشە. پاشەڵی سپییە. مێیە و بارِی ئەو باڵندەیە پشتیان قاوەیی پرِ رِەنگە و بەرزگیان زەردی رِێ رِێی قاوەییە. نەوی فرِە. ژینگەی وەک شمقارِی گەنمانە. زستانان زۆر دەبێ. (87)

شمقارِ–ی زەلان (417)

سنقر تالابی
Circus aeruginosus
Busard des roseaux
Marsh Harrier

**٤٨ تا ٥٥** سانتیمێترە. لە شمقارِەکانی تر بەهۆی گەورەتر بوون و باڵی پانتر و بەنەبوونی سپیایی لە پاشەڵدا دەناسرێتەوە. نەوی فرِە و کاتی فرِین باڵ لێدەدا و قیت رِایاندەگرێ. نێرە نێوچاوانی و باڵی بۆری توندە. کلک و سەری شاباڵی بۆرە. سەر و پاش مل و سینگی زەردی رِێ رِێیە و بەرزگی قاوەیی. مێیە و نێرەبارِ زۆریان بۆراییان نییە و تەواو قاوەیی پرِ رِەنگن، سەر و شانیان کاڵە. ئەو باڵندەیە بۆ گرتنی نێچیر لە ئاسمانەوە لوور دەبێتەوە سەر عەرز. لە زل و شوێنی قامیشەڵانی پرِ دەژی. هێلانەی گەورەی خۆی لە قامیشەڵانی ناو ئاو ساز دەکا. (87)



شمقارِ–ی سپی (418)

سنقر سفید
Circus macrourus
Busard pêle
Pallid Harrier

**٤٣ تا ٤٨** سانتیمێترە. نێرە سەر و بەرزگی سپی بەرچاوە. کلک و باڵی بۆری ئاماڵ شینی رِوونە. رِەشایی سەری باڵانی سێ سووچە. پاشەڵی بۆرە. جووچکە و مێیەی ئەو باڵندەیە لە شمقارِی گەنمان جوێ ناکرێتەوە. بەبارِی بەهۆی بەرزگی خورمایی و رِێ رِێ نەبوونی لە بارِی شمقارِی بۆر جوێ دەکرێتەوە. کردەوەی وەک شمقارِی گەنمانە. ژینگەی وەک شمقارِی بۆرە، بەڵام لە بیابانی ویشک و دەشت و تەپۆڵکەی تەنکەدار دەژی. زستانان زۆرتر دەبێ. (87)

شمقارِ–ی گەنمان (419)

سنقر گندم زار
Circus pygargus
Busard cendré
Montagu’s Harrier

**٤٠ تا ٤٥** سانتیمێترە. نەختێک لە شمقارِی بۆر بچووکتر و باریکترە. باڵی باریکتر و نووک تیژترە و فرِینی سووکترە. مێیە زۆر وەک مێیە شمقارِی بۆر دەچێ، بەڵام سپیایی پاشەڵی لە جێی سپی بۆرە؟، دوو خەتی رِەشی بەباڵیدا کشاوە. رِێ رِێی قاوەیی لەسەر زگ و رِانی هەیە. بارِی هەر وەک مێیە دەچێ، بەڵام بەرزگی خورماییە. کردەوەی وەک شمقارِی بۆر دەچێ. لە زەل، مێشەڵان و زەویوزاران دەژی. بەگەل لەناو گیای شەدار، بەهەڵکەوت لەناو زەویدا، هێلانە ساز دەکا. هاوینان زیاتر دەبینرێن. (87)

### ج– شەهێنەکان Falcons

باڵیان درێژ و نووک تیژ و کوورِە. کلکیان تا رِادەیەک درێژە. دندووکیان کورت و قەڵانگییە؛ دندووکی سەرێیان مشارەی هەیە. قامکی لاقیان درێژ و بەهێز و قەڵانگییە. لە فرِیندا زۆر بەهێزن و دەتوانن لەنگەر بگرن. نێچیر بەلاق هەڵدەگرن و بەندووک ملی دەپەرِێنن. زۆرجار نێچیر بەلاقێک رِادەگرن. نێرە و مێیەیان یەک رِەنگە، بەڵام مێیەکان گەورەترن. لەسەر دار، رِەوەز و عەرز هێلانە ساز دەکەن. زیاتر بەتەنیا دەژین. بریتین لە: باڵەبان، ترۆمتە، ترۆمتەی سەر سوور، ترۆمتەی لاق سوور،

سی کوژ، شەهێن، لەیل، هەڵەکەسەمای بچووک، هەڵەکە سەمای گەورە.

بالەبان (420)

بالابان
Falco cherrug
Faucon Sacre
Saker

**٤٥** سانتیمێترە. پشتی و باڵی قاوەیی کاڵە. سەر و پاش ملی سپی ڕێ ڕێی قاوەییە. خەتی باریکی بەلاملی داکشاوە. بەرزگی سپییە و تا ڕادەیەک خاڵخاڵ یان ڕێ ڕێیە. کلکی قاوەیی پڕ ڕەنگە. بەپانایيدا ڕێ ڕێی سپییە. خاڵ و میلی سەر و بەرزگی ئەو باڵندەیە بەباری زۆرتر و لێک نزیکترە. باڵندەیەکی دڕ و نەترسە و هێرش دەباتە سەر گیانلەبەری گەورەتر لە خۆی. لە دەشتی بەرین و بیابان دەژی. لەسەر داری بڵیند و ناو تاتە بەردان هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر دەبێ. (88-98)

ترۆمتە (421)

ترمتای
Falco columbarius
Faucon émérillon
Merlin

**٢٦** تا **٣٢** سانتیمێترە. نێرە پشتی کەوە ڕەنگە و سەری کلکی خەتی پانی ڕەشی تێدایە. بەرزگ و ژێر باڵی گشتی ڕێ ڕێیە و بەڕەنگی خورمایی. مێیە لە نێرە گەورەترە، پشتی قاوەیی پڕ ڕەنگە و کلکی ڕێ ڕێی قاوەیی و کرێمیە. خەتی لاجانگی نییە. لەکاتی هێرشی خێرای خۆی بۆ سەر نێچیر نەوی دەفڕێ. لە شوێنی ئاوەڵا، دەوروبەری زەلان، تەپۆڵکەی خیزکێن و ڕەوەزی لێواری دەریا دەژی. (88)

ترۆمتە–ی سەر سوور (422)

ترمتای سر حنایی
Falco chicqueru
Faucon chicquera
Red-headed Merlin

نێرە **٢٩** و مێیە **٣٣** سانتیمێترە. سەر و پاش ملی سوورە. پەڕ و باڵی ڕێ ڕێیە و خەتی پانی ڕەشی لە کۆتایی کلکیدا هەیە. پشتی بۆرە و لەسەر شان و باڵی خەتی قاوەیی هەیە. شاپەڕی باڵی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. بەرزگی سپییە و بەپانایيدا ڕێ ڕێی



وردی ڕەشی تێدایە. باڵندان ڕاو دەکا. لە شوێنی ئاوەڵا، دەشتی بەرین. شوێنی تەنکەدار دەژی. لەسەر دار هێلانە دەکا. جارجار کۆنە هێلانەی قەلەڕەشان ئاوەدان دەکاتەوە. (98)

ترۆمتە–ی لاق سوور (423)

ترمتای پا سرخ
Falco vespertinus
Faucon kobez
Red-footed Falcon

**٣٠** سانتیمێترە. باڵی ئەوەندە درێژە دەگاتە سەر کلکی. دەوری چاو و نەرمەی دندووک و قاچی سووری نارنجین. نێرە لە مێیە زۆرترن. بۆری ئاماڵ ڕەشن و ژێر کلکیان شێ ڕەنگە. مێیە سەری خورمایی ڕەنگە و بەرزگی خۆڵەمێشیە و خەتی لاجانگی قوڵە و ئامال ڕەشە. پشت و کلکی خەتی بۆریان بەپانایيدا کشاوە. لە ئاسمان لەنگەر دەگرێ و لەو کاتەدا خۆی خوار ڕادەگرێ. تاوپەڕی ئێواران مێش و مەگەزان ڕاو دەکا. گیانلەبەری وەک کوللە و مشکیش لەسەر عەرز دەگرێ. لەدەشتی خاوەن پنچک و داری کورت، لێواری لێڕەواران و دەوروبەری زەوییان دەژی. (97)

سی کوژ (424)

بحری
Falco peregrinus
Faucon pélerin
Peregrine Falcon

**٣٨** تا **٤٨** سانتیمێترە. ئەو باڵندەیە بەهۆی باڵی درێژ و نووک تیژ و کلکی کە وردە وردە بەرەو دوا تەسک دەبێتەوە؛ هەروەها شێوە فڕینی کۆترانی و باڵ لێدانی دەناسرێتەوە. سمێڵی پان و ڕەشە. نێرە سەری ڕەشە و پشتی بۆرە، بەرزگی سپی مەیلەو زەردە و خەتی ڕەشی باریکی بەپانایيدا کشاوە. مێیە لەنێرە گەورەتر و پڕ ڕەنگترە. بەباری قاوەیی پڕ ڕەنگە و بەرزگی زەردی ڕێ ڕێیە. کاتی ڕاو لە ئاسمانەوە باڵان دەبەستێ و بەتوندی لوور دەبێتە خوار. باڵندەی بەقەرا کۆتر و کەت ڕاو دەکا. لە شوێنی ئاوەڵا، کوێستانان و ڕەوەزی بەرز دەژی. زستانان لەسەر زۆنگ و زەل و شامان دەبینرێ. لەسەر هەڵدێری پڕ نشێو، جاری واشە لە کۆنە خانووان، هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆرە. (88)

شەهێن (425)

**شاهین**

Falco pelegrinoides

Faucon de Barbrie

Barbary Falcon

**٣٥ تا ٤٥** سانتیمێترە. وەک سی کوژ دەچێ؛ بەڵام پشتی پتر قاوەییە و کەمتر بۆرە و ڕێ ڕێی کەمتری بەپانایی بەرزگیدا هاتووە. سینگی زۆرتر ڕێ ڕێیە. سەری خورمایی ڕەنگە. بەهۆی پشتی پڕ ڕەنگتر و سمێڵی خڕ و قاوەیی مەیلەو ڕەش لە باڵەبان جوێ دەکرێتەوە. کردەوەی وەک سی کوژە. لە تەپک و دەشت و کوێستانان دەژی. زستانان دەچێتە دەشتان. لە لێواری ڕەوەزی بەرز هێلانە ساز دەکا. (98)

لەیل (426)

**لیل**

Falco subbuteo

Faucon hobereau

Hobby

**٣٠ تا ٣٥** سانتیمێترە. لە ئاسمان زۆر دەسوورێتەوە. وەک سی کوژ توند دەفڕێ، بەڵام باڵی درێژتر و کلکی کورتتر دێتە بەرچاو. باڵندەی وەک چوڕە و پەڕەسلێرکە ڕاو دەکا. ئێواران مێش و مەگەزان دەخوا. ڕان و ژێر کلکی شێ ڕەنگە. سمێڵی نووک تیژە و لەهی سی کوژ باریکترە. بەرزگی بەدرێژاییدا ڕێ ڕێی لێک نزیکە. بەباری پشتی قاوەیی مەیلەو ڕەشە. بن ڕانی شێ ڕەنگ نییە. لە مێشەڵان، نزیک داری تاک و تەرا دەژی. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. جاری وایە کۆنە هێلانان ئاوەدان دەکاتەوە. هاوینان زۆرە. (88)

هەڵەکەسەما-ی بچووک (427)

**دلیجە کوچک**

Falco naumanni

Faucon crécerellette

Lesser Kestrel

**٣٠** سانتیمێترە. بەهۆی بچووکتر بوون. ڕەنگ ڕوونتر بوون. کردەوەی نەترسانە، زریکە زریکی زۆر و هێلانە ساز کردنی بەگەل لە هەڵەکەسەمای گەورە جوێ دەکرێتەوە. نێرە پشتی سووری مەیلەو شێیە و خاڵ و پنۆکی نییە. سەر و کلکی لەنێری هەڵەکەسەمای گەورە شینترە. مێیە و باڕ هەر وەک مێیە و باڕی هەڵەکەسەمای گەورە



دەچن. ژێر باڵ و کلکی کاڵتر و دەوری ڕەشە. لەسەر باڵی پنۆکی گەورەی کەوە ڕەنگی هەیە. جنجرووکی سپییە. مێش و مەگەز ڕاو دەکا. لە کۆنە خانوو، دۆڵ و دەرەی تەنگ و بەردەڵانی دەژی. بەگەل لە کونە دیواری بڵێند و کونی ڕەوەزان وێڕای کۆتر و چۆلەکان هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (97)

هەڵەکەسەما-ی گەورە (428)

**دلیجە**

Falco tinnunculus

Faucon crécerelle

Kestrel

* سەماکەرە، مشک گرە

**٣٤** سانتیمێترە. باڵی نووک تیژە و کلکی باریکە. لە ئاسمان لەنگەر دەبەستێ و باڵ لێدەدا. نێرە پشتی شێ ڕەنگ و خاڵخاڵە. بەرزگی زەردە و خاڵی ڕەشی بڵاوی تێدایە. سەر، ئاتەگ و کلکی بۆرە و خەتی پانی ڕەشی لە کۆتایی کلکیدا هەیە. مێیە پشتی قاوەیی مەیلەو خورمایییە و بەپاناییدا ڕێ ڕێیە. کلکی خورمایی ڕێ ڕێیە. لەسەر دار، دارتێل و ڕەوەزان هەڵدەنیشێ. بەرەو با ڕادەوەستێ و باڵ لێدەدا. بۆ گرتنی نێچیر لوور دەبێتە عەرز. لە چیمەن، زەویوزار، جێی ئاوەڵای لێڕەواران، قەراغ چەمان و تەنانەت نزیک ئاوایی و شاران دەژی. لە کۆنە هێلانەی قەلەڕەشان یان سەر ڕەوەزی بڵێند؛ کۆنە خانوو و کۆنی داران هێلانە ساز دەکا. (97)

چ- کۆلارەکان Kites

* کۆڵلارە

باڵیان درێژ و گۆشەدارە. کلکیان دوو هاچەیە. بەنەرمی دەفڕن و کاتی فڕین لەنگەر دەبەستن. نێر و مێیەیان یەک ڕەنگن. لەسەر دار هێلانە دەکەن. جارجار لە کەلاکی ئاژەڵ کەڵک وەردەگرن. بریتین لە: کۆلارە، کۆلارەی خەنەیی.

کۆلارە (429)

**کورکور**

Milvus migrans

Milan noir

Black Kite

**٥٥** سانتیمێترە. وەک کۆلارەی خەنەیی دەچێ، بەڵام کلکی قاوەیی ئاماڵ بۆرە. پەڕ و

باڵی پڕ ڕەنگترە. تووکی ژێر باڵی کاڵە. دوو هاچە بوونی کلکی لە کۆلارەی خەنەیی کەمترە. سەری دندووکی قەڵانگییە. پەڕ و باڵی خەنەیی توندی پنۆک پنۆکە. زۆرتر لەسەر ئاوی ناو ئیشکایی لە حاڵی فڕیندا دەبینرێ. بەباڕی خاڵی ئاماڵ سپی لەژێر باڵیدا هەیە. لە دەوری کەلاک دەهاڵێن. لە ئاسمان لەنگەر دەبەستن و باڵیان لە ئاست لەشیان ڕادەگرن. لە نزیک دەریاچە، چەم، شوێنی پڕ دار یان کەم دار و درەخت، کەنار ئاوایی و شاران دەژی. زیاتر بەپۆل لەسەر دار هێلانە ساز دەکەن. جاری وایە کۆنە هێلانەی قەلەڕەشە ساز دەکەنەوە. (73)

کۆلارەی خەنەیی (430)

کورکور حنایی

Milvus milvus

Milan royal

Red kite

٦٠ سانتیمێترە. کلکی درێژ و ئاماڵ شێیە. باڵی باریک و گۆشەدارە و ژێر دامێنی سپییە و سەری شاباڵی ڕەشە. پشتی سووری مۆرە. بەرزگی خورماییە و ڕێ ڕێی ڕەشە. سەری سپی واشە و ڕێ ڕێ، بەباڕی کاڵترە و سەری زەردگوێزییە. ئەو باڵندەیە کەلاک خۆرە و لە گیاندارانی زیندووی وەک باڵندەی بچووک و تەنانەت کەروێشکیش کەڵک وەردەگرێ. لە تەپۆڵکەی پڕ دار دەژی. جاری واشە لە شوێنی نزم و ئاوەڵا و داری تاک و تەرا دەبینرێ. لەسەر دار هێلانە دەکا. (73)

## ح- هەڵۆکان Eagles

جۆرە باڵندەیەکی ڕاوچی گەورەن و بەباڵی درێژ و پان، بەسەر و دندووکی گەورە و کلکی پان و لاقی تووکن دەناسرێنەوە. فڕینیان لە ئاسماندا شکۆیەکی تایبەتی هەیە. ڕەنگی پەڕ و باڵیان زۆر بەئارامی ئاڵوگۆڕی بەسەر دادێ؛ لە ئاکامدا ناسینەوەی باڕی ئەو باڵندانە دژوارە. نێرە و مێیەیان یەک ڕەنگە، بەڵام مێیە کەمێک لە نێرە گەورەترە و پێی دەڵێن تەوار. هێندێک هەڵۆ هەر کەلاک دەخۆن. لەسەر دار یان ڕەوەزی بەرز هێلانە ساز دەکەن. بریتین لە: پەڕکوور، دووبرا، هەڵۆ، هەڵۆی پەنجە کورت، هەڵۆی ٢ خاڵخاڵ، هەڵۆی خاڵخاڵی بچووک، هەڵۆی دەریایی پالاس، هەڵۆی دەریایی کلک سپی، هەڵۆی گەندومی، هەڵۆی لاق تووکن.



پەڕکوور (431)

عقاب طلایی

Aquila chrysaëtos

Aigle royal

Golden Eagle

٧٥ تا ٨٣ سانتیمێترە. کلکی پان و چوار سووچە. شاپەڕی پێشەوەی باڵی بڵاو و قیتە. پەڕ و باڵی تەواو بۆری توندە؛ سەر و پاش مل و شاپەڕی وردی باڵی تەڵا ڕەنگە. بەباڕی لەسەر ئەستووراییی باڵی تووکی سپی دەبینرێ. کلکیشی سپییە و خەتی پانی ئاماڵ ڕەشی لە سەری کلکی دایە. بەچوونە سەری تەمەن ئەو سپیایە لە کەمی دەدا. بەهۆی گۆڕانی ڕەنگی پەڕ و باڵی ئەو باڵندەیە بەباڕی لەگەڵ هەڵۆکانی تر بەچەتوونی لێک جوێ دەکرێتەوە. لە کوێستانی کەم گیا و ئیشک و ڕووتەن، ڕەوەزی قەراغ بەحران و دەشتان دەژی. لەسەر لێواری هەڵدێران و جارجاریش سەر داران هێلانە دەکا. (74)

دووبرا (432)

عقاب دو برادر

Hieraaetus fasciatus

Aigle de Bonelli

Bonelli’s Eagle

* دووبراڵە، کەوزەن، هەڵۆی دووبرا، هەڵۆی کەوان

٦٥ تا ٧٢ سانتیمێترە. پشتی مۆرە. سەری باڵی ڕەشە و پاش ملی کاڵترە. خاڵێکی سپی گەورەی لەسەر پشت هەیە. کلکی درێژە و شەش خەتی کاڵ و خەتێکی پان و ئاماڵ ڕەشی بەسەری کلکیدا هاتووە. کاتی فڕین بەهۆی بەرزگی سپی و ڕێ ڕێ، باڵی درێژ و باریک و ئاماڵ ڕەشی دەناسرێتەوە. بەباڕی سەری سوورخونە، بەرزگی قاوەیی ئاماڵ خورماییە و ڕێ ڕێ و خەتی ورد وردی بەکلکیدا هاتووە. لە دوو ساڵیدا تەواو قاوەیی دەبێ و بەرزگی تەواو سپی هەڵدەگەڕێ. باڵندە و کەروێشکان ڕاو دەکا. لە فڕیندا زۆر چالاکە. لە کوێستانی پڕ ڕەوەز دەژی. زستانان دێتە دەشتان. لەسەر ڕەوەز و داران هێلانە ساز دەکا. (85)

هەڵۆ (433)

عقاب شاهی
Aquile heliaca
Aigle impérial
Imperial Eagle

٧٧ تا ٨٢ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. سەر و پاش ملی زەردی کاڵە. ئەگەر پیر بوو سپی هەڵدەگەڕێ. چەند پەڕی سپی لەسەر شانی هەیە. کلکی چوار سووچە و پێنج تا حەوت خەتی بۆری بەپانایییدا کشاوە و لە کلکی پەڕکوور کورتترە. لە ئاسمان کە لەنگەر دەبەستێ. باڵی لە ڕێکی بەدەنی ڕادەگرێ. پشتی باڵی تەواو بۆری توندە. بەباری زەردگوێزییە و کلک و شاپەری باڵی توندترە و خاڵێکی گەورە و کەم ڕەنگی لە نێوان باڵ و خوارەوەی پشتی هەیە. ئارام و تەپە لە فڕین. لە دەشت، چیمەنی بەفرەوان و زەلان دەژی. لە داری بڵیند و دوورە دەست هێلانەی گەورەی خۆی ساز دەکا. (86)

هەڵۆ-ی پەنجە کورت (434)

عقاب مارخور
Circaëtus gallicus
Circaëte Jean-le-Blanc
Short-toed Eagle

٦٣ تا ٦٧ سانتیمێترە. بەرزگ و ژێرباڵی سپییە. سینگ و ملی بۆری توند و ڕێ ڕێیە، هەندێکیان ئەو بۆراییەیان نییە، لە نزیکەوە چەند ڕیز خاڵی توند لە ژێر باڵیدا دەبینرێ. سەری وەک سەری کوند دەچێ. دندووکی قوڵە و چاوی گەورە و نارنجییە. پشتی قاوەیی مەیلەو بۆرە. شاپەڕی نادیار بەپانایییدا کشاوە. هێزی فڕینی زۆرە. کاتی لەنگەر بەستن لاقی شۆڕ ڕادەگرێ. مار، مارمێلکە، بۆق و گیانلەبەری لەو چەشنە ڕاو دەکا. لە نشێوی کێوان و دۆڵ و دەرەی تەنگ، لێڕەواری دوورە دەست، دەشتی زەل و تەپۆڵکەی خیزەڵانی قەراغ دەریا دەژی. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (85)

هەڵۆ-ی خاڵخاڵ (435)

عقاب تالایی
Aquila clanga
Aigle criard
Spotted Eagle

٦٥ تا ٧٢ سانتیمێترە. نێرە قاوەیی توندە، بەڵام بەرزگی کەمێک کاڵترە و لە



ئەستوورایی کلکیدا کەمێک تووکی سپی هەیە. کلکی قوڵە و خڕە. سەر و دندووکی چکۆڵەیە و ملی باریکە. باڵی لە پەڕکوور پانترە. بەباری خاڵخاڵی گەورە و سپی لەسەر پشتی دایە و پاشەڵیشی سپییە. لەکاتی فڕیندا دوو خەتی کاڵی لەسەر باڵان دیارە. جوولانەوەی تەپە. لە نزیک دەریاچە، چۆم و زەلان دەبینرێ. لەسەر دار یان پنچکی ناو لێڕەواران هێلانە ساز دەکا. زستانان زۆر هەیە. (86)

هەڵۆ-ی خاڵخاڵی بچووک (436)

عقاب جنگلی
Aquila pomarina
Aigle pomarin
Lesser Spotted Eagle

٦٠ تا ٦٥ سانتیمێترە. زۆر وەک هەڵۆی خاڵخاڵ دەچێ، بەڵام لەو بچووکترە. سەر و باڵی کاڵترە. جاری وایە پنۆکی سپی لە پاشەڵی هەیە. بەباری پنۆکی سپی بچووکترە و کەمتری لە هەڵۆی خاڵخاڵ لەسەر پشت هەیە و خاڵێکی گەورەی خەنەیی لە پاش مل هەیە. لە فڕیندا بەکلکی باریک، باڵی باریک و ڕەپ و شەش شاپەڕی پێشەوە دەناسرێتەوە. وەک هەڵۆی خاڵخاڵ کاتی لەنگەر بەستن سەری باڵی شۆڕ ڕادەگرێ. لە نزیک ئاو دەژی. لە شوێنی پڕ دار و دوورە دەست و ئاوەڵا دەبینرێ. لەسەر دار هێلانە ساز دەکا. هاوینان زۆرە. (86)

هەڵۆ-ی دەریایی پالاس (437)

عقاب دریایی پالاس
Haliaeetus leucoryphus
Pygargue de pallas
Pallas’s Sea Eagle

٦١ تا ٨٨ سانتیمێترە. سەر و سینگی سپی واشە. کلکی سپییە و سەری کلکی ڕەشە. بەباری زۆر وەک هەڵۆی دەریایی کلک سپی دەچێ، بەڵام درێژتر و بۆرترە و باڵی کورتترە. لە چیمەنی بەرفرەوانی نزیک چۆم و دەریاچان دەبینرێ. بەدەگمەن لە قەراغ دەریا دەبێ. (74)

هەڵۆ-ی دەریایی کلک سپی (438)

عقاب دریایی دم سفید
Haliaeetus albicilla
Pygargue á queue blanche
White-tailed Eagle

٤٨ تا ٩٠ سانتیمێترە. باڵی زۆر گەورە و پانە و سەری باڵی خڕە. کلکی سپییە. سەری گەورە و قاوەیی کاڵە. دندووکی زەردە. بەباڕی سەر و کلک و دندووکی قاوەیی ئاماڵ ڕەشە. کلکی سێ سووچی لەهی پەڕکوور کورتترە. لاقی تووکی پێوە نییە. لە فڕیندا وەک دالاش دەچێ. لەسەر ئاو بۆ گرتنی ماسی نەوی دەفڕێ و جاری وایە بینە دەکێشی. دەتوانێ گیانلەبەری گەورەی وەک ئاسک ڕاو بکا. کەلاک خۆرە. لەکەنار دەریاچە و ئاوی گەورە و دوورە دەستی ناو ئیشکایی دەژی. هێلانەی خۆی لەسەر ڕەوەز و داری بڵیند ساز دەکا و زستانان زۆر هەیە. (74)

هەڵۆ-ی گەندومی (439)

عقاب دشتی
Aquila rapax
Aigle ravisseur
Tawny Eagle

٦٥ تا ٧٧ سانتیمێترە. پەڕ و باڵی قاوەیی پڕ ڕەنگە. بەپانایی سەر کلکی قوڵە و خڕیدا خەتی بۆری نادیار کشاوە. زۆر وەک هەڵۆی خاڵخاڵ دەچێ، بەڵام ئەمەیان پنۆکی زەردی مەیلەو سووری لە پاش ملی هەیە و سپیایی لە کلکیدا نییە. بەباڕی ئاماڵ قاوەییە و شاپەڕی باڵی ئاماڵ ڕەشە و لەکاتی فڕیندا دوو خەتی باڵی کاڵ دیاری دەدا. تەپە و ماوەیەکی زۆر لەسەر عەرز هەڵدەنیشێ. نەوی فڕە و کاتی فڕین باڵی کەمێک کووڕ ڕادەگرێ. مار، بۆق و کەلاکی گیانلەبەران دەخوا. بەچووکترە بوون، سەر و دندووکی بچووکترە، کلکی کورتتر ڕێ ڕێی بێ ڕەشایی سەر کلکی لە پەڕکوور جوێ کرێتەوە و لە چاو هەڵۆ سەری ڕەشتر و بەدەنی چکۆڵەترە. لە چیمەن و دەشتان دەژی. لەسەر عەرز هێلانە ساز دەکا. (86)

هەڵۆ-ی لاق تووکن (440)

عقاب پر پا
Hieraaëtus pennatus
Aigle botté
Booted Eagle



٤٥ تا ٥٢ سانتیمێترە. بەدوو ڕەنگی کاڵ و توند هەیە. کاڵی ئەو باڵندەیە زۆرترە. بەرزگی سپییە. شاپەڕی باڵی ئاماڵ ڕەشە و کلکی زەردی ئاماڵ دارچینییە کە درێژە و سەری چوار گۆشەیە. تووکی وردی باڵی زەردە و شاپەڕی پڕ ڕەنگترە. جۆری توندی ئەو باڵندەیە تەواو قاوەییە. کلکی کاڵترە. فڕینی جوان و تیژە و زۆرتر لە فڕیندا خوار پێچە دەکا و بەنێو داراندا دەفڕێ. گیانلەبەری بچووک ڕاو دەکا. لە لێڕەواران دەژێ، لە شوێنی ئاوەڵا و کەم دار ڕاو دەکا. لەسەر داری بڵیند هێلانە ساز دەکا و هاوینان زۆر هەیە. (85)

## تۆرەمەی هەڵۆی ماسیگر (59F)
Family PANDIONIDAE

هەڵۆ-ی ماسیگر (441)

عقاب ماهی گیر
Pandion haliaëtus
Balbuzard pêcheur
Osprey

٥٠ هەتا ٥٧ سانتیمێترە. نێرە و مێیەی یەک ڕەنگە. دوای هەڵۆی پەنجە کورت تەنیا هەڵۆیەکە پشتی بۆرە و بەرزگی سپییە و خەتی سینگی ئاماڵ بۆرە. سەری سپی و کاکۆڵدارە. خەتی چاوی ڕەشە و بەرەو پاش ملی کشاوە. باڵی باریک و درێژە. ژێر باڵی سپییە و خەتی ڕێ ڕێیە. کلکی ڕێ ڕێیە قاوەییە. لەسەر ئاو بەئارامی لەنگەر دەگرێ و بۆ گرتنی ماسی لوور دەبێتە ناو ئاو و لاقی پێش هەموو جێیەکی دەگاتە ئاو. بۆ وچان لەسەر دار یان ڕەوەزی کەنار ئاو هەڵدەنیشێ. هەمیشە نزیک گۆل و چەمی گەورە یان دەریا دەژی. لەسەر دار، لەسەر ڕەوەز و دورگەی دوورە دەست و تەنانەت لەسەر عەرزی خیزەڵان هێلانە ساز دەکا. (73).

## تۆرەمەی هەنجیرەخۆرە (60F)
Family ORIOLIDAE

* زەردی شامی

هەنجیرە خۆرە (442)
پری شاهرخ
Oriolus oriolus
Loriot d’Europe
Golden oriole

**٢٣** سانتیمێترە. نێرە زەردە. باڵ و کلکی ڕەشە. کەناری کلکی زەردایی هەیە. مییە و باری ئەم جۆرە باڵندەیە کەسکی مەیلەو زەردە. هەروەها باڵ و کلکی پڕ ڕەنگترە و بەرزگی ئامالٚ بۆری خەت خەتە. لەناو لک و پۆی داران خۆ نەدیو دەکا؛ زۆرتر لەسەر چلۆوکی دار دەنیشێ. لەسەر دار دەژی. لەناو داری میوە، کەنار ڕووبار و لێڕەوارانداd دەبینرێ. هێلانەی خۆی بەدوو لکی دار هەڵداوەسێ. هاوینان زۆر هەیە. (230)



## پێرستی تۆرەمەکان

# پێڕستی کوردی

## پێڕستی فارسی

# پێڕستی لاتینی

## پێڕستی فەرانسەوی

# پێڕستی ئینگلیزی



30 - پێ‌بەقوونەی سەربەکڵاوە



33 - پێ‌بەقوونەی گەردن سوور



31 - پێ‌بەقوونەی شاخدار



32 - پێ‌بەقوونەی گەردن ڕەش



29 - پێ‌بەقوونە





119 - دەریابڕەی گەروو ڕەش



120 - دەریابڕەی گەروو سوور


317 - کوتری بچووکی دەریایی



282 - قەڵمراوی بچووک


212- شاوه سوڵتانی
شاوەسوڵتانی
214- شاوه مل‌درێژ
شاوه مل‌درێژ
رەسیو
بار
217- واقی شەوێ
بار
رەسیو
بار
215- واق
رەسیو
بار
رەسیو
216- واقی بچووک


بار
283- قەل‌مراوی بچووک
318- کەلک
بارّی کەلکەسپی
بار
319- کەلکی بۆر


213 - شاوە شینە
ئامال‌رەش
ئامال‌سپی
210 - شاوە سپیلکە
209 - شاوە زردەکە
208 - شاوە ریخنە
211 - شاوە سپیلکەی بچووک




334 - لەگ لەگ
رەسیو
دندووک بێڵە
بار
335 - حللێز
رەسیو
271 - قەرەناز
رەسیو
بار
270 - دندووک بێڵە
272 - قەرەنازی ئەفریقایی
181 - سوورە قوڕینگ



376- خاسە سی
باپ
379- سی قەشانی گەورە
378- سی قەشانی بچووک
باپ
375- بووکەسی






رەسیو
باپ
383- قووی بێدەنگ
باپ
384- قووی گەورە
رەسیو
باپ
382- قووی بچووک
رەسیو
377- سی کوێرە



391 - لووت پان
392 - مراوی سپیلکە
394 - سەر سووری
بەحری
398 - مراوی سەر رەش
395 - مراوی جقەدار
393 - سەر سوور
396 - مراوی خەتەیی




388 - سوونە
389 - قوون رەش
387 - دووکورە
390 - قەشان
386 - خلخل
385 - جورە


372 - کانوونی کاکۆڵدار
373 - کانوونی گەورە
371 - کانوونی سەرسپی
381 - هەڵە ئانج
باپ
380 - سوورە قانگ




397 - مراوی رەشکە
هاوین
هاوین
399 - مراوی کلک دریژ
زستان
زستان
400 - ملهوڕ
401 - ملهوڕی رەش
374 - مراوی سەرسپی


441 - هەڵۆی ماسیگر
رەسیو
باڕ
430 - کۆلارەی خەنەیی
رەسیو
باڕ
429 - کۆلارە




باڕ
رەسیو
باڕ
438 - هەڵۆی دەریایی کلکسپی
باڕ
پەرکوور
رەسیو
437 - هەڵۆی دەریایی پالاس
رەسیو
باڕ
431 - پەرکوور


406 - باشوو
ئاماڵ ڕەش
ئاماڵسپی
409 - باشووی لاق تووکن
باشووی لاق تووکن
408 - باشووی لاق درێژ
ئاماڵسپی
ئاماڵڕەش
ئاماڵسپی
باشووی لێرمواران
ئاماڵسپی
ئاماڵڕەش
بار
410 - باشووی لێرمواران




♂
♀
بار
402 - باز
♀
بار
♂
♀
♂
404 - واشە
♂
واشەی گەورە
♂
بار
♀
405 - واشەی گەورە


رەسیو
بار
رەسیو
رەسیو
433 - هەڵۆ
بار
رەسیو
رەسیو
439 - هەڵۆی گەندوورەی
رەسیو
رەسیو
بار
هەڵۆی خاڵخاڵ
رەسیو
بار
436 - هەڵۆی
خاڵخاڵی بچووک


432 - دوو برا
رەسیو
بار
رەسیو
بار
بار
رەسیوی ئامال رەش
ئامال رەش
ئامال سپی
باری ئامال سپی
بار
440 - هەڵۆی لاق تووکن
ئامال سپی
ئامال رەش
434 - هەڵۆی پەنجەکورت


♂
♂
404- واشە
405- واشەی گەورە
403- سەقر
407- باشووی چاوسپی
422- ترزمتەی سەر سوور
426- باڵەبان
425- شەهین


باب
♀
♂
باب
♀
423- ترزمتەی لاق سوور
♂
♂
427- هەڵکەسەمای بچووک
♂
♀
♂
428- هەڵکەسەمای گەورە
♀

362 - مریشکاویلە




366 - مریشکاویلەی سوور پەلەک




365 - مریشکاویلەی دندووک سەوز




363 - مریشکاویلەی بچووک




364 - مریشکاویلەی خەنەی






360 - ڕەش بەشەی دندووک سوور




359 - ڕەش بەشە




361 - تاوسە





162- ڕەوڕەوەی سینگ شین
باڕ
هاوین ♂
157- ڕەوڕەوە بۆرە
زستان
هاوین
زستان
هاوین
158- ڕەوڕەوە زێڕە
زستان
زستان
زستان
159- ڕەوڕەوە زێڕەی ئاسیایی
زستان
زستان
164- ڕەوڕەوەی کێوی
هاوین
زستان
هاوین
زستان
هاوین
زستان
155- بەردگێرە




118- دەنووک سوورە
167- زیقاوە
باڕ
ڕەسیو
168- زیقاوەی دەشتی
باڕ
ڕەسیو
35- جلووت
زستان
هاوین ♂
زستان
♀ هاوین


باڕ
166 - ڕەوڕەوەی گەردن بە خاڵی گەورە
باڕ
165 - ڕەوڕەوەی گەردن بە خاڵی بچووک
♂
باڕ
160 - ڕەوڕەوەی بچووک
هاوین
زستان
زستان
232 - شێلاقەی
بەرزگ ڕەش
زستان
هاوین
زستان
238 - شێلاقەی
شنڕەنگ




زستان
زستان
زستان
231 - شێلاقەی بچووک
زستان
زستان
هاوین
239 - شێلاقەی کلک سپی
زستان
هاوین
زستان
227 - شێلاقە بۆرە
235 - شێلاقەی دندوکپان


240 - شێلاقەی لاق سوور
زستان
هاوین
زستان
237 - شێلاقەی رەش باڵ
زستان
241 - شێلاقەی لاق کەسک
زستان
هاوین
228 - شێلاقە شامی
♂
زستان
♀
♂
هاوین
229 - شێلاقە شەنگە


230 - شێلاقە عەسڵە
233 - شێلاقەی چلپاوان
234 - شێلاقەی خاڵخاڵ
236 - شێلاقەی دندووک قیت


245 - قوڕاویلکەی ناوینە
244 - قوڕاویلکەی گەورە
242 - قوڕاویلکەی بچووک
246 - مرەلارە




222 - ئەحمەد ڕاوکەر
224 - ئەحمەد ڕاوکەری
برز سپی
هاوین
226 - ئەحمەد ڕاوکەری
دندووک باریک
زستان
زستان
هاوین
223 - ئەحمەد ڕاوکەری
بال سپی
هاوین
زستان
هاوین
زستان
225 - ئەحمەد ڕاوکەری
خەنەیی


156 - دەیدومەک
161 - رەوڕەوەی خیزی
رستان
169 - زیقاوەی کلک سپی
207 - شالووری گەورە
206 - شالوور
243 - قوڕاوپلکەی ناق
163 - رەوڕەوەی قرژاڵ گر


370 - نکینە
بار
♀
369 - چەکمە سوورە
♂
زستان
بار
هاوین ♂
206 - شالوور
333 - ودودە


باڕ
ڕەسیو
354 - ماسی گرەی
پشت ڕەشی گەورە
باڕ
ڕەسیو
یەکساڵە
356 - ماسی گرەی زێوین
ڕەسیو
353 - ماسی گرەی پشت ڕەشی بچووک
باڕ
ڕەسیو
باڕ
350 - ماسی گرە


358 - ماسی گرەی سەر ڕەشی گەورە
هاوین
باڕ
ڕەسیو
ڕەسیو
هاوین
هاوین
باڕ
ڕەسیو
351 - ماسی گرەی بچووک
357 - ماسی گرەی
سەر ڕەشی بچووک
باڕ
ڕەسیو
هاوین
هاوین
باڕ
ڕەسیو
355 - ماسی گرەی دندووک باریک



بار
تووله‌ک
هاوین
343 - ماسی خۆرکه‌ی ره‌ش
تووله‌ک
زستان
بار
هاوین
344 - ماسی خۆرکه‌ی
ره‌شی باڵ سپی
زستان
هاوین
بار
349 - ماسی خۆرکه‌ی گوناسپی
زستان
زستان
هاوین
338 - ماسی خۆرکه
هاوین
348 - ماسی خۆرکه‌ی قه‌شانی دندووک زه‌رد




هاوین
زستان
بار
341 - ماسی خۆرکه‌ی
دندووک ئه‌ستوور
زستان
بار
هاوین
342 - ماسی خۆرکه‌ی ره‌نگ بۆر
هاوین
زستان
340 - ماسی خۆرکه‌ی خه‌زه‌ری


340 - ماسی خۆرکەی خەزەری
341 - ماسی خۆرکەی دندووک ئەستوور
346 - ماسی خۆرکەی سەر بە کلاوەی گەورە
345 - ماسی خۆرکەی سەر بە کلاوەی بچووک
342 - ماسی خۆرکەی دەنگ بۆر
338 - ماسی خۆرکە
339 - ماسی خۆرکەی بۆر
347 - ماسی خۆرکەی قەشانی دندووک ڕەش
348 - ماسی خۆرکەی قەشانی دندووک زەرد




♂
♀
290 - کورکورەی بەر زگ سپی
♂
289 - کورکورەی بەر زگ ڕەش
♂
♀
291 - کورکورەی خاڵخاڵ


302 - کوندە شەخسە
297 - کوندە پشیلە
304 - کوندە قوتە
300 - کوندە زیرە
ئامال بۆر
ئامال قاوەیی
ئامال سپی
ئامال رەش
295 - تاق تاق
301 - کوندە سپی


296 - تاق تاقی بۆر
303 - کوندە شەخسەی خالخال
299 - کوندە زیرە
298 - کوندە رزمال
305 - کوندە گایە


41 - چورە سەیرەیی
♂
♀
42 - چورە گەڵوازە
50 - چورەی پەنجە کورت
51 - چورەی
پەنجەکورتی بچووک
48 - چورەی بیابانی
49 - چورەی بیابانی کلک رەش
44 - چورە هیندی




23 - پەرە سلێرکە
105 - چەوروورکەی بچووک
25 - پەرە سلێرکەی پاشەڵ سوور
28 - پەرە سلێرکەی کاڵی رەوەزان
26 - پەرە سلێرکەی خیزەڵان
27 - پەرە سلێرکەی رەوەزان
24 - پەرە سلێرکەی پاشەڵ سپی



47 - چۆرەی باڵ سپی
54 - چۆرەی ڕەش
♀
♂
39 - چۆرە پۆپنەکی
53 - چۆرەی داران
46 - چۆرەی ئاسمانی گەورە






43 - چۆرە مل ڕەش
40 - چۆرە دندووک درێژە
45 - چۆرەی ئاسمانی بچووک
52 - چۆرەی پەنجە کورتی هێوم
55 - سریلە
7 - باریکەی دندووک درێژ


♂
زستان
♀
♂
11- بەرگاویلەی بەڵەک
هاوین
M. f. lutea
10- بەرگاویلەی بۆر
♂
♀
M. f. beema
M.f. thunbergi
بەرگاویلەی بۆر
پاێز
♂
پاێز
12- بەرگاویلەی زەرد
♀
♀
13- بەرگاویلەی
سەر زەرد
♂




6- باریکەی داری
9- باریکەی میرگان
رەسیو
پاێز
3- باریکە
هاوین
زستان
8- باریکەی مل سوور
زستان
هاوین
4- باریکەی ئاوی
5- باریکەی پاپنە درێژە


رەسیو
14 - بەرلووزەوە
باپ
247 - فیسقە
185 - سەعوەی لێرەواران
183 - سەعوەی کێوی
182 - سەعوەی برۆ سپی
184 - سەعوەی مل رەش


280 - قەلە رەشە
273 - قالاوو
رەسیو
باپ
279 - قەلە بەڵەکی
281 - قەلە گورگە


87 - چۆلەکە پەرچەی ساوی
92 - چۆلەکە پەرچەی کلک پان
77 - چۆلەکە پەرچەی چەڵتووکان
78 - چۆلەکە پەرچەی چەمان
93 - چۆلەکە پەرچەی کلک چەتری
81 - چۆلەکە پەرچەی ڕێ ڕێ




80 - چۆلەکە پەرچەی ڕۆژهەلاتی زەلان
72 - چۆلەکە پەرچەی برۆ سپی
86 - چۆلەکە پەرچەی زەیتوونی زەلان
82 - چۆلەکە پەرچەی ڕێ ڕێی زەلان
84 - چۆلەکە پەرچەی زەلان
96 - چۆلەکە پەرچەی گەورەی زەلان


73 – چۆلەکە پەرچەی برۆ زەرد
97 – چۆلەکە پەرچەی لاوێتان
79 – چۆلەکە پەرچەی چیفچاف
98 – چۆلەکە پەرچەی لێرەواران
90 – چۆلەکە پەرچەی سەوز
70 – چۆلەکە پەرچەی بچووک
♀
♂
67 – تانج زێرین


101 – چۆلەکە پەرچەی، نیقابداری بچووک
102 – چۆلەکە پەرچەی نیقابداری هێوم
71 – چۆلەکە پەرچەی بچووکی داران
95 – چۆلەکە پەرچەی گەورەی داران
74 – چۆلەکە پەرچەی بە جیرە جیر
68 – چۆلەکە پەرچە
94 – چۆلەکە پەرچەی کلک درێژ


141 - کەڵەکەترەی بەڵەک
150 - کەڵەکەترەی گوێ رەش
ئامال سپی
ئامال رەش
144 - کەڵەکەترەی بیابانی
147 - کەڵەکەترەی دەشتان




148 - کەڵەکەترەی سەر رەش
142 - کەڵەکەترەی بەڵەکی باشووری
149 - کەڵەکەترەی کلک سپی
145 - کەڵەکەترەی پاشەڵ سوور



131 - رەشێشەی باڵ سوور
132 - رەشێشەی پشت شین
130 - رەشێشەی باغی
134 - رەشێشەی گەورە
♂
135 - رەشێشەی مل رەش






336 - لیکوو
337 - لیکووی زەلان
368 - مەلە رۆژە
♀
♂
♂
♀
بار
327 - گورەویچنەی سمێڵدار
253 - قولەنەی گەورە


هاوین
250 - بەردەوان
زستان
252 - قولنەی جەنگەلی
117 - دارەوان
251 - قولنەی بچووک




326 - گورەویچنەی تورکستانی
330 - گورەویچنەی گەورە
3
323 - گورەویچنەی بۆر
۴۰۹ - چرخریسک سرآبی
324 - گورەویچنەی پاش مل سپی
328 - گورەویچنەی شین
329 - گورەویچنەی کلک درێژ
ئاسایی
325 - گورەویچنەی پشت شین
سەر سپی
ئامال رەش


64- چۆلەکەی سینگ ڕەش
62- چۆلەکەی داران
ڕەسیو
پاپ
65- چۆلەکەی کێوی
59- چۆلەکەی بەفری




56- چۆلەکە
61- چۆلەکەی چۆمان
57- چۆلەکەی بلوورچی
60- چۆلەکەی بیابانی
66- چۆلەکەی گەردن زەرد
58- چۆلەکەی بزر
63- چۆلەکەی سەر ڕەش


بار
186 - زەنگولە میرە
198 - سەیرەی کەسک
194 - سەیرەی زەرد
192 - سەیرەی دندووک گەورە




202 - سەیرەی لێرەواران
ستان
هاوین
196 - سەیرەی سەر رەش
هاوین
زستان
189 - سەیرەی پاشەل سپی
زستان
191 - سەیرەی دندووک خاچی



195 – سەیرەی سوور
197 – سەیرەی سینگ سوور
199 – سەیرەی کێوی
زستان
173 – سوورپرەی زەلان
هاوین




193 – سەیرەی ڕەش
201 – سەیرەی نێو چاوان سوور
187 – سەیرەی باڵ سوور
200 – سەیرەی مەغوولی
188 – سەیرەی بۆر
190 – سەیرەی چێرەیی


178-سوورپەی لاجانگ سپی
174-سوورپەی سەر بۆر
179-سوورپەی لاجانگ زەرد
176-سوورپەی سەر شین
172-سوورپەی ری ری


171-سوورپە مێرگە
175-سوورپەی سەر زەیتوونی
177-سوورپەی کێوی
170-زەردەزێڕە
180-سوورپەی لیموویی